

# لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا

## خەم مەخۆ بێگومان خودا لەگەڵمانە

**Dont worry , God is with us**


نووسین و وەرگێڕانی:

ئاسیا عەلی




ناوی کتێب : دڵتەنگ مەبە {لَا تَحْزَنْ}

بابەت : قورئان ، فەرموودە ، وتە و ئامۆژگاری

مەبەستی نوسەر : ئومێد بوون بە خودا

نووسینی : ئاسیا علی

تایپ : نووسەر

چاپ : ٢٠٢٣

تیراژ :

نۆبەی چاپ : چاپی یەکەم

ساڵی چاپ : ٢٠٢٣

بڵاوکار : کۆشکی سەرا

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردن () ی ساڵی (٢٠٢٣) ی پێدراوە



پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار ، سوپاسێك شایستە بە گەورەیی بەدیهێنەری هەموو بوون ، صەلات و سەلامی خودا لە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و سەرمەشق و ئالوبەیت و یارانی ..

خوێنەری ئازیزو خۆشەویست ئەم کتێبەی لە خزمەتی بەڕێزتاندایە گوڵچینی هەندێك وتەو ئامۆژگاری و قورئان و فەرموودەیە کە هیوادارم سودی بۆ خوێنەری ئازیز هەبێت .

بەڕاستی مرۆڤی ژیرو تێگەیشتوو کە خالقی خۆی بناسێ پەی بە گەورەی و شکۆ و دەسەڵاتی بنێت چێژ لە وتەکانی وەردەگرێت و گوێڕایەڵی دەبێت و فرمانەکانی جێ بەجێ دەکات . ئاینی ئیسلام فەرمانی پێ کردوین کە چەندی لە توانامان دا بوو ئامۆژگاری خۆمان و نزیکەکانمان و دەوروبەرمان بکەین ئاگاداریان بکەینەوە لەو شتانەی دەبێتە مایەی زەرەرو زیان و ناڕەحەتی دەهێنێتە ڕێگایان ..



(١)

بۆ ئەو کەسەی ئەمە دەخوێنێتەوە ....

خوای گەورە بەختەوەری بێکۆتاییتان پێ ببەخشێ ،
خوای گەورە هەمووخەون و ئارەزو وئاواتەکانت بەدی بهێنێت .

خوای گەورە دوعاکانتان قەبووڵ بکات .
خوای گەورە پلەیەکی بەرزتان پێ ببەخشێت بۆ ناو بەرزترین ئاستەکانی بەهەشت .!!!





(٢)

عبد الله بن مسعود – رضي الله عنه - :

ئەو ماڵەی قورئانی تێدا ناخوێنرێت

هاوشێوەی ماڵێکی وێرانە کە هیچ ئاوەدانیێکی تێدا

نیە...

مصنف ابن أبي شيبه (٣٠٠٢٢).



(٣)

پیاوێك هاتە لای ئەبو الدرداء گووتی :

ئامۆژگاریم بکە

فەرمووی : لەکاتی خۆشی یادی خودا بکە

لەکاتی ناخۆشی بەهاناتەوە دێ ...





(٤)

« لەسوننەتەوە نییە بە کەم سەیرکردنی خواردن یان عەیبە لێ گرتنی «

لە (أبي هريرة )ەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمێت :

نەمبینیوە پێغەمبەری خودا ( ﷺ ) هەرگیز عەیب و کەم و کوڕی گرتبێ لە هیچ خواردنێك ، ئەگەر حەزی لێ بووایە دەیخوارد وە ئەگەر حەزی لێ نەبوایە بێدەنگ دەبوو ...

| رواه مسلم (٢٠٦٤) |



(٥)

كان التابعي الجليل الحسن البصري يقول :-

يا ابن آدم ، أي شيء يعز عليك من دينك إذا هانت عليك صلاتك !؟...

ئەی نەوەی ئادەم ، چ شتێکی دینەکەت لات گەورە دەبێت ئەگەر نوێژەکەت لەلات کەم نرخ بێت !؟ ....

{ شعب الإيمان للبيهقي ٢٩٠٧ }





(٦)

" ڕازیم بە قەدەرەکانت خودایە
هەر چەندە بەدڵی منیش نەبێت ".....



(٧)

" ڕەنگە پەروەردگار پەیوەندییە حەرامەکانت تێك بدات
بۆ ئەوەی بتکات بە حەڵاڵی کەسێکی ڕاست ".....



(٨)

" الله قورئانی دابەزاندووە بۆ کارپێکردنی کەچی
قورئان لەلای موسوڵمانان تەنها بۆ خوێندنەوەیە "

» شێخ محمد صالح المنجد «





(١٠)

" هاجەرە خاتوون "
لەنێوان صەفا و مەروادا
دەهات و دەچوو تاکە ئاواتی کەمێك ئاو بوو
خوای گەورە ئاوی زەمزەمی بۆ هەڵقوڵاند
کە هەتا ئەمڕۆ وشکی نەکردوە
بۆیە تۆش هەرگیز بێ ئومێد مەبە
چونکە دەرلێکردنەوەی خودا کە هات
ئاوا دێت.....!



(١١)

" کاتێك ناتوانی وشەکانت ڕێکبخەی بۆ دوعاکانت
خەم مەخۆ خودا ئاگای لە دڵتە " ....





(١٢)

خۆزگە یەك کۆڵان دوور دەبووم

خۆزگە کۆڵانێکیش نا گەڕەکێك دوور بام

سبەی دەهاتم بەتەنها بۆ لات

پرسیارم لێدەکردی کە من باشم یا نا

بەئەهلی خۆتم حساب دەکەی !!

دەگریام دەردی دڵی خۆمم دەڕشت تۆش دوعات بۆ کردبام

منیش دەهاتمەوە و پێکەنین لە ڕوخسارم جیا نەبووبا

خۆزگە نزیک دەبووم لێت یارسول الله ....



(١٣)

"خۆزگە نێوانی من و خودا باش بوایە

با نێوانی من و عالەم هەر خراپ بووایە"...

"ئیمامی شافعی"





(١٤)

ابن مسعود فەرموویەتی :

«سوێند بەو خوایەی هیچ خوایەك نییە جگە لەو شایەنی پەرستن بێت ، هیچ بەندەیەك نییە گومانی باش بەخوای گەورە ببات لەهەر شتێكدا ، ئیلا ئەوەی پێ دەبەخشێت کە دەیەوێت»...

حسن الضن بالله لابن إبي الدنيا (٨٢).



(١٥)

ئیمامی عەلی دەفەرمووێ :

هەرگیز بەچاوی دوێنێ سەیری هیچ کەسێ مەکەن

بەڵکو لە بەرەبەیان دا تۆبەی کردبێ ....

تەوبەکار خۆشەویستی الله یە ....





(١٦)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :
بەڕاستی کەسی وا هەیە بە ڕەوشتە جوانەکەی دەگات بە پلەی ئەو کەسەی کە بە شەو شەونوێژ دەکات و بە ڕۆژ بە ڕۆژووە»...

السلسلة الصحيحة (٧٩٥).



(١٨)

" المؤنسات الغاليات "
کچان گران بەهاو بەنرخن.

پێغەمبەر (ﷺ) .





(١٩)

" بەندەی خواناس غەم لە دڵیدا و شادی لە ڕوخساریدایە".

محمد (ﷺ).



(٢٠)

اللهم حياة هادئة مليئة بلطفك .

خوایە ژیانێکی ئاراممان پێ ببەخشە کە پڕ بێت لە میهرەبانیت .





(٢١)

هەندێك كات هێندە موكوڕ دەبیت لە ئازار دەتوێیتەوە .
بەڵام ڕێگەیەكی ڕۆشن دیدەن دەكەیت و ئارام دەگریت .
هەندێ جار هێندە سەخت بە ئەرزدا دەدرێیت
سەرتاپا گیانت شكاوی دەبێت و نەدەنگی شكانی
پەراسووەكانت گوێبیست دەبێت نەبرینێك بەسەر
جەستەت دەبێت ، لێرەوەیە كە هەرچی ئازاری شكان
هەیە بەردەبێتە بەر گیانت و كوڵپەی سووتان دەدات ناخت
وناشسووتێت .
ئەمە ڕابردووی زۆرێكمان بوو، ڕەنگیشە ئێستای هەندێكمان بێت .
جوانی ئازار و شكان ئەوەیە دەتگۆڕێت ئازار قبوڵی خۆیەتی ناكات .
بەخاتری بەڵێنەكانی ئیلاهی ئارام بووین و موژدەی پێمان دا ئەگەر
لە خۆڕاگران بین پاداشتمان دەداتەوە .
لە ئازار بەهێزتر خودایەك بوو كە پێی فەرموون :
" لەگەڵتم بەندەكەم "
ئێمە تێمان پەڕاند و لەكۆتایی ئەوەی مایەوە

{ الحمد الله على كل حال }.





(٢٢)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :

خۆشەویسترین شوێن لای خوای گەورە مزگەوتەکانن .

وە ناشرینترین و بێزارترین شوێن بازاڕەکانن .

{ صحيح الجامع الصغير للألباني رقم ١٦٧ }.



(٢٣)

یەکێك لە جوانترین دووعاکان :

" الله ! أحلامنا بين يديك فحققها "

خودایە ...!

ئارەزووەکانی ئێمە لەدەستی

ڕەحمەتی تۆدایە کەواتە بیکە ڕاست .





(٢٤)

ئەگەر بارگرانی تاوانێکت لەسەر شانە و هەنگاوەکانی ژیانتی

قورستر و سەختر کردوە ،

لێ مەگەڕێ و زمانت قورس مەکە لەوەی داوای لێبوردن بکەیت ،

شەرم مەکە لەگەڕانەوەت و قسەکردنت بۆ خوای گەورە

ئەو تۆو گەڕانەوەکەتی خۆشدەوێت وەك هەموو جارەکانی تر

لێت خۆشدەبێت و دەرگاکانت بۆ دەکاتەوە .

ژیان قورس مەکەن بۆ تاوانێك و هەڵەیەك کە دڵنیایت خودا لێت

خۆشدەبێت و تەنها هەنگاوی یەکەمی خۆتی ئەوێت ،

خودا زاتێکی هەمیشەیی و خاوەن بەڵێنی

{ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا } یە ، هەر کات ویستت قسەی بۆ بکە

بەڵام ئەوەشت بیر نەچێتەوە ئێمە هەموان مردویەکین کە

هێشتا کاتی ناشتنمان نەهاتوە پەلە بکە تا کاتت تەواونەبووە

ووە دڵنیابە لێت خۆشدەبێت چونکە خۆشیدەوێیت .





(٢٥)

" اللهم أكتب لي ما أحب كما تحب "
خوایە ئەو شتانەی حەزی پێدەکەم بۆم بنوسە
وەك ئەوەی تۆ چۆن حەزی پێدەکەی .



(٢٦)

ئەو دوعایەی
لەسوجدەدا جێی دەهێڵی
ڕۆژێك دەیبینیتەوە لە سوجدەی شوکرانەدا .!



(٢٧)

قال الشافعي رحمه الله :
"هەر کەسێك بەردەوام بێت لە دووعا کردن و پەیوەستبێت
پێوەی وە لە دەرگا بدات ، ئەوە بۆی ئەکرێتەوە ".

« سیر أعلام النبلاء ٦/٣٦٩ «





(٢٨)

« إن وجدت من يسعد اليوم لا ينسى من اهتم بك با لأمس .»
ئەگەر ئەمڕۆ کەسێکت دۆزیەوە دڵخۆشت دەکات
لەبیری مەکە دوێنێ کێ گرنگی پێدەدایت .



(٢٩)

خودا شەرمەزارت ناکات لە کاتێکدا دەزانیت کە تۆ لە ناختەوە دووبارە دەکەیتەوە و دەڵێیت :

« خودا لەگەڵ منە »





(٣٠)

کاتێك گوێم لەم ئایەتە بووە
وەك بڵێی دەرمانی دڵمیان کرد
کە خوای گەورە دەفەرموێت :
کاتێك بەهەشتەییەکان دەچنە بەهەشت سوپاسی
پەروەردگار دەکەن نارەحەتی و ئازاری لەسەر لابردن ..
دونیای ئێمە بۆ ئەهلی موسوڵمان تەنگە
ئارامگری پێدانی بەهەشتە ....



(٣١)

[ وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ] ناوەکانی خوا
هەموو جوان و پڕشکۆن [فَادْعُوهُ بِهَا ]
دەسا ئێوەیش هەر بەو ناوانەوە بانگی
بکەن ، لاڵەو نزاو داوا هەر بەوانە بکەن .

الأعراف ١٨٠





(٣٢)

ژیان نە ئامانجە نە دەسکەوت !

تەنیا ڕێگایەکە لە شوێنێکەوە دەست پێی دەکات و لە شوێنێکیشدا کۆتایی پێی دێت ؛ ئێمە لەم ڕێگایەدا لەوانەیە زۆر دەسکەوتمان هەبێ و زۆر شتیش لە دەست بدەین.

زۆر کەس بەدەستدەهێنین و زۆر کەسیش لەدەست دەدەین ؛ بمانەوێ و نەمانەوێ دەبێ بژین ، نازانین بوونی ئێمە لەسەر ئەم زەویە چ حیکمەتێکی تێدایە ، بەڵام ئێمە باش دەزانین کە خوای گەورە ئەقڵی داوەتە ئێمە و پێمان دەڵێ ، ئەگەر باش بەکاری بهێنی دەستکەوتی باش بەدەست دەهێنی و دەگەیتە سەلامەتی و بەختەوەری .

ئێمە لە سەردەمێکدا دەژیین کە زۆر بەختەوەرین لە مرۆڤەکانی سەدەکانی پێش خۆمان ، هەموو ئیمکانیات و پێداویستی ژیانمان لە بەردەستدایە بەڵام دڵمان پێی خۆش نیە ، بەردەوام نیگەرانی ئایندەیین ! چونکە بیر ناکەینەوە نازانین چۆن بژیین و سوود لەو ئامرازانە وەرناگرین کە بەر دەستمانەو بەردەوام چاومان لەشتی ترە.!

د. شێرزاد سوڵتان





(٣٣)

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێ : پێغەمبەری خودا (ﷺ)
فەرمویەتی : ئیمان بریتییە لەوەی بڕوابێنی بە خواو ،
بە فریشتەکانی و کتێبەکانی و
پێغەمبەرەکانی و پێگەیشتوانی و ئیمان
بێنی بە زیندووبوونەوەی
ڕۆژی دوایی ، وە ئیمان بێنی بە هەموو قەدەر( بە چاکەو بە خراپیەوە) .



(٣٤)

فێری ئارامگرتن بە .
ژیان هەمیشە بەو جۆرە نییە
کە هیوای پێدەخوازیت .!





(٣٥)

بەچیا ئەزانی جلەکەت شەرعیە ..؟

_ بەوەی ئەتوانم نوێژیشی پێوە بکەم بێ ئەوەی هیچ پارچە جلێك و لەچك یان شتێکی تری بۆ زیاد بکەم بەهەمان ئەو جلانەی بەرامبەر خودا بوەستم و قسەی لەگەڵ بکەم .!



(٣٦)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :

بزانە بە دڵنیایی تۆ هیچ سوجدەیەك نابەی بۆ خودا ، ئیلا خودا بەهۆی ئەو سوجدەیەوە پلەیەك بەرزت دەکاتەوە و خراپەیەکت لەسەر لادەدات .

| صحیح الجامع (١٠٦٩) |





(٣٧)

ڕۆژێك دێت لەخۆشیدا هاوار دەكەیت و

دەڵێی ئیلاهی دەمزانی بۆ هیوام ناكەی .!!



(٣٨)

تەماشای ئاسمان بكە .

یەكێك هەیە لەوێ تۆی خۆشدەوێت ..!!



(٣٩)

وەڵامت ئەداتەوە ، مادام تۆ

دڵنیایت كە وەڵامت ئەداتەوە .!!





(٤٠)

وازهێنان لە گوناهـ واجبە ،

پاداشتی بەجێهێنانی واجبیش گەلێ لەهی سونەتەکان زیاترە .

پاشبەندەکان٢٢٥



(٤١)

« لە هۆکارە هەرە گەورەکانی بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوا خوێندنی قورئانە »



(٤٢)

« بۆ شتێك مەگەڕێوە کە خودا تۆی لێی ڕزگار کرد ».





(٤٣)

ابن القيم فەرموویەتی :

هەر چەندە بەندە سووربێت لەسەرداوایەك و زۆر داوا بکات لەخوای گەورە زیاتر خۆشی ئەوێت و لەخۆی نزیك ئەخاتەوە و پێی ئەبەخشێت .

حادي الأرواح ٩١



(٤٤)

ببە بەکەسێکی سەنگین کە لە سوجدەدا نزای بەدەست هێنانت بکەن .





(٤٥)

بەردەوام بوون لەسەر حەمد : خێر وبەرەکەت بەردەوام دەکات .

بەردەوام بوون لەسەر استغفار : دەرگا داخراوەکان دەکاتەوە .

بەردەوام بوون لەسەر سەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) :

ئاواتەکان دێتە دی وە خەمت نامێنێ و گوناهت لا ئەچێت .



(٤٦)

« ژن تا ئەبەد جوان و پیرۆزە مادام دەبێت بە دایك .»

« شێرزاد حەسەن »





(٤٧)

ئارامی
واتە لەنێوان سەدان کێشە وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت
پێبکەنی چونکە دەزانی خودایەك هەیە کە ئاگای لێتە
کەبە هەبوونی هەموو شتێك چارە دەبێ..!



(٤٨)
کەمی شەرم و شکۆ ئاماژەیە بۆ مردنی دڵ و ڕۆح ...

«إبن القيم الجوزی»





(٤٩)

سەبر ماندووکەرە

سەبر ئاسان نیە

سەبر لەسەر لێوارەکە جێت دەهێڵێت بەڵام خودا دەفەرمووێ :

بارگرانی ناخەمە سەر ڕۆحێك کە نەتوانێت هەڵیگرێت .

{ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا } ..



(٥٠)

«يغدو الإنسان هشًا دون القرآن كُل حُزنٍ يكسره، كُل كلمةٍ تؤذيه»

مرۆڤ بەبێ قورئان لاواز دەبێت

هەموو غەم وخەفەتێک دەیشکێنێت ،

وەهەموو وشەیەک ئازاری ئەدات ..





(٥١)

نازانی چی سائێک پێت ئەوترێت

(قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ ). (طه-٣٦)

واتا : بەڕاستی ئەوەی داوات کرد پێت درا ...



(٥٢)

يا رَبُّ لي حَاجَةٌ فِي النَّفسِ تَعلمُهَا يَا رَبُّ مَرحَمَةً بِي قُل لَهَا كُونِي .

ئیلاهی شتێک هەیە لە ناخدا پێی دەزانیت

خودایە بەزەییەک بە من و بەو شتە بڵێی ببە ...





(٥٣)

مەولانا لەسەر زاری حەقەوە (الله) دەڵێت :

- دەرگای ئێمە، دەرگای نا ئومێد کردن نییە، گەر سەد جاریش تۆبەت شکاندووە، جارێی دیکە وەرەوە

«گوڵاوی مەولانا»



(٥٤)

هیچ کات درەنگ نییە تۆ هێشتا هەلت هەیە

بگۆڕێیت بۆ ئەو کەسەی کە بۆ ئەوە دروست کراویت ..



(٥٥)

باشترین کەس ئەو کەسانەن کە ڕازین بە

بەشی خودا لە هەر بارودۆخێکدا بن ....





(٥٦)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱسْتَعِينُوا بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ (١٥٣)

ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خوا بکەن بەهۆی ئارامگرتن و نوێژ کردنەوو، دڵنیابن کە خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە ...



(٥٧)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

اصبروا حتى تلقوني على الحوض .

ئارام بگرن هەتا لەسەر حەوزی کەوسەر پێمدەگەن ..

| متفق علیه |





(٥٨)

لەنوێژ وعیبادەتەکانم تەمبەڵم چارم چیە ؟!
پیاوێک هاتە خزمەت رسول الله ﷺ وتی
یارسول الله ﷺ بابەتەکانی شەریعەت زیادیان کردووە بەسەرما
لێیان تەمبەڵم ) .)
شتێکم پێ بڵێ پێوەی دامەزراوبم رسول الله ﷺ فەرمووی :
لا یزال لسانك رطباً من ذکر الله. صحیح ابن ماجه ٣٠٧٥

ئەگەر نوێژ و عیبادەتەکانت لاقورس بووە وە ئەتەوێت خۆشەویست بینەوە لات و وازبێنیت لەخراپەو دونیاو ڕووبکەیتە چاکە بەردەوام بە لە زیکرکردنی الله تعالی و ئەم دوعایەت هەمیشە لەبیربێ و بیڵێوە کە رسول الله صلی الله علیه وسلم فێری معاذ رضي الله عنه ی کرد لەپاش ئەوەی فەرمووی کە خۆشی ئەوێت پاشان فەرموی لەپاش هەموو نوێژێک بڵێ :
اللهم أعني على
(ذکرك وشکرك وحسن عبادتك)..





(٥٩)

هیچ شتێك هەمیشەیی نیە ،
هەموو شتێك دێت و دەڕوا.
خەم ، ئازار، بیرکردنی کەسەکان، خۆشی، بەختەوەری،
هەموویان بۆ ساتێك هەن و دواتر نامێنن ،
هەڵبەتە ژیان بەو جۆرەیە
ئەگەر بە شێوەیەکی دروست لە ژیان
بڕوانین و لە ژیان کردن بگەین بە
ڕاستی ئەوا هۆکارێکی زۆر هەن بۆ دڵ خۆشبوون
و باش ژین کردن بەڵام هەموو شتێکیش قوربانی دانی دەوێ

هیچ کەسێك نایەت بڵێ فەرموو ئەوە بەختەوەری
و دڵ خۆشبە بۆ هەمیشە ، بەڵکو دەبێت خۆت بە دەستی بێنیت ....





(٦٠)

بۆ ئەوەی بژیت ، دەبێت بەهێزبیت ،
بەهێزی ، تەنها هێزی ماسولکە و بازو نیە ،
بەڵکو هێزی بەرگەگرتنی هەموو ڕووداوە
ناخۆشەکانە کە دێنە ڕێگات ،
هێزی وازهێنانە لەو کەسانەی شایەنت نین ،
هێزی قەناعەتە بە تواناکانی خۆت ،
هێزی ئارامگرتنە لە کاتی ڕوودانی کارەسات ،
هێزی هەڵسانەوەیە دوای کەوتن ..



(٦١)

تەنها ئەم ئایەتەت بەسە بۆ ئەوەی دڵ نەدەین بە دنیا
[انك ميت وانهم ميتون].. {الزمر: ٣٠}
_ ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم)
_ بەڕاستی تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن...!





(٦٢)

إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ

«خودا گوێی لە نزاکانمانە»



(٦٣)

وَٱسْتَغْفِرُوا ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ

داوا لە الله بکەن کە لە تاوانەکانتان خۆش ببێت.

بێگومان الله لێخوشبوی بەندەکانە ،

و لە ئاستیان بەڕەحم و میهرەبانە...



(٦٤)

هەر شتێك کە خەیاڵی بۆ دەکەیت

توانای بەدی هێنانیت هەیە ئەگەر بتەوێت ...





(٦٥)

لە یادمان بێت کە بە شکانی قاچی کەسانی تر

خۆمان باشتر ناڕۆین بە ڕێگادا

لە یادمان بێت کە بە شکاندنی دڵی کەسانی تر

ئێمە خۆشبەختر نابین .

وە خۆزگە بزانین کە ئەگەر ببینە هۆی فرمێسکی کەسێك

ئیر ڕووبەڕووی ئەو نابیتەوە

ڕووبەڕووی خوای ئەو دەبینەوە ....



(٦٦)

بێ ئەمەکییە ..

لەبەر هەبوونی یەك زەحمەت

«کە پڕە لە حیکمەت»

هەزار ڕەحمەت لە یاد بکەین ..





(٦٧)

بەختەوەری ئەوە نیە کە مرۆڤەکان لەدەرەوە دەبینێت
بەختەوەری لە دڵی مرۆڤدایە دڵ ئەگەر خۆشبێ ،
مرۆڤ دڵخۆشە....



(٦٨)

تووشی هەر ناخۆشییەك بوویت ،
خۆت مەدە دەست نائومێدی !
با هەموو دەرگاکانیش بە ڕووتدا داخرابن ، خوا
دەرگای نوێ بە ڕووتدا دەکاتەوە .
هەمیشە سوپاسگوزاری خوا بە ، ئەوە
ئاسانە کە هەموو شتێك بە دڵی تۆ بێت و سوپاسی خوا بکەیت ،
سۆفی تەنیا بۆ ئەو شتەی پێی بەخشیوە ، سوپاسی خوا ناکات ،
بۆ ئەو شتەیشی بێبەشی کردووە لێی ، سوپاسی دەکات ..





(٦٩)

سَيَستَجيب لأنّهُ اللّٰه

«وەڵامت دەداتەوە چونکە پەروەردگارە».



(٧٠)

«وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ»

سست ودڵ لاواز مەبن وخەمبار مەبن هەر ئێوە بەرز وبڵندترن

ئەگەر ئێوە بڕواداربن ....



(٧١)

ڕۆژێك بەقەد بێتاقەتییەكانت

دڵخۆش ئەبی چاوەڕێكە ...





(٧٢)

پێبکەنە و ئارام بە

چونکە خودا نزیکە.

پێویستیەکانت دەزانێت .

ترس ونائارامیشت دەزانێت ..

بە نزا و ئاواتەکانت دەزانێت ..

هەموو ئەوانەی ناخت ئەزانێت ..

ئاواتەکانت دێنێتە دی وڵامی نزاکانت دەداتەوە

و پێویستیەکانت تەواو دەکات..

ژیان سەراو ژێر ئەکات تا وڵامی نزاکانت بداتەوە ..

ئارام بە خودا دەتوانێت هەموو ئەو شتانە بکات

تەنها ئارام بگرە ...





(٧٣)

خودایە..
هەندێك جار دونیاو نامەردیەكان دەرد بۆ دڵم دێنن
بەڵام هێزی ئومێدی تۆ لە چاوەكانم ناڕۆن
باش دەزانم ئاگاداری دڵمیت
تا كاتێك تۆم هەیە ، غەمێك نیە
هەبوونی خودا كارێكی كەم نییە ..



(٧٤)

ئەو پەنجەرە دابخە كە ئازارت دەدات
هەرچەندە دیمەنەكانی دەرەوەی
جوانیش بن ...



(٧٥)

ئارام گری هەندێ كات
خودی هەوڵدانە ...





(٧٦)

خوایە گیان تۆ منت بەدی هێناوە و بۆ خۆتت بەدی هێناوم بۆ تۆ لە دایک بووم مەمکەرە نێچیری تەڵە و داری هیچ دروستکراوێك....

ئەبو حەسەنی خەرقانی



(٧٧)

ڕۆحی خۆت ببەخشە لە پێناو عیشقی خودا ،
سوێند دەخۆم هیچ ڕێگایەکی تر بوونی نییە .!



(٧٨)

بە تەنیا و بە کەرامەت بژی باشترە لەوەی وەك جێگرەوەیەك بژی ..





(٧٩)

مرۆڤ ساغ و سەلامەت دەبێت بە
نوێژەکانی و نزیك بوونی لە خودا ..



(٨٠)

خەمباری ، دڵتەنگی ، ناڕەحەتی ، بێزاری .
یان لە هەر دۆخێکی ناخۆشیدایت ،
دڵنیابە کە زۆری ڕۆشتووەو کەمی ماوە
بشزانە کە ژیان دەرفەتە باش و
خۆشەکانت پێ نابەخشێت ، بەڵام لەو دەرفەتەی پێت دەدات ..
تۆ دەتوانی هەموو شت دروست بکەیت گەر ژیرانە
مامەڵە بکەیت و زیرەکانە پلان داڕێژی بۆ بکەیت ...





(٨١)

هەرگیز نیگەرانی ئەمڕۆ کێشەی سبەینێی تۆ حەل ناکات

تەنها خۆشی ئەمڕۆت لەناو دەبات ..



(٨٢)

هەر کاتێك ویستت وازبێنی ..

بەو هەستە خۆشەی دوای گەیشتنت بیر بکەوە ،

بە بەدی هاتنی ئارەزووەکانت بە هەستی ڕازیبونی دەرونت

بە پێکەنین لە قوڵایی دڵت بە فرمێسکی خۆشی دایکت

بە زەردەخەنەی مەغرورانەی باوکت بیربکەوە و بەردەوام بە ..





(٨٣)

دورکەوتنەوەی هەندێك کەس لە ژیانت میهرەبانی خودایە،
تەنها لەگەڵ ڕۆشتنی کاتدا بۆت دەرەکەوێت ..!!



(٨٤)

هەندێك جار ، باشترین وەڵام بێدەنگییە .



(٨٥)

جوانترین ئارام گرتن ئەوەیە
تۆ تاقیبکرێیتەوە و دڵت بڵێت «الحمد الله» ...





(٨٦)

ڕۆژگارێك دێت مرۆڤ هاوار دەكات و هەموو داوای ئەوەیە دەڵێت تكایە بە چاوێكی میهرەبان سەیرم بكەن ..



(٨٧)

ئارام بگرە
بەخوا بە ئەندازەی هەموو فیشەكەكانی ئەم جیهانە .
ڕێگەی تیماركردنی برینەكانت هەیە ..!



(٨٨)

ئارام گرتن ئەوەیە بە گوێی ژیاندا بچرپێنی و بڵێی ،
ناتوانی بمخەی هەتا خودا لەگەڵم بێت ...





(٨٩)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت :

خاوەن زانست و زانیاری هەموو شتێك نزای خێر و داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکەن هەتا نەهەنگیش (ماسیش) لە نێو دەریادا..!

السلسة الصحيحة برقم (٣٠٢٤) .



(٩٠)

محمدی کوڕی سیرین دەڵێت :

زۆر هەڵەکاران ئەوانەن کە زۆر باسی هەڵەی خەڵکی دەکەن ..!

المجالة و جواهر العلم (٦/٨٦) .







(٩١)

يسمع الله صوتك و يعلم ما قلبك
ولن يتركك لوحدك ، فلا تحزن .

خوا گوێی لە دەنگتە و دەشزانێت چی لە دڵتە
وە بەتەنیاش جێت ناهێڵێت ، بۆیە غەمبار مەبە .



(٩٢)

مەنزڵە بەرزەکان بە بەڵاو ناخۆشی نەبێت بەدەست نایات .

«ابن تيمية»







(٩٣)

«تمادينا بالتفكير ونسينا بأن أقدارينا مكتوبـة».

درێژەمان بەبیرکردنەوەدا

لە بیرمان چوو کە چارەنوسمان نوسراوە .



(٩٤)

سوفیانی ثە وری « رحمة الله « فەرموویەتی :

ئەگەر شەیتان منی بەزاند بەتاوان کردن .

ئەوا منیش ئەیشکێنم بە تەوبە کردن .



(٩٥)

ئەوەت لەبیربێت بەهەشت پڕە لەو

تاوانبارانەی کە گەڕاونەتەوە .





(٩٦)

ئەزانیت کاتێك بەکەسێك ئەڵێیت تۆ زۆر جوانیت چاوەکانی ئەگەشێتەوەو بزەیەکی شیرین دەکات و خۆی جوان دەبینێت ، جوانییەکانی دەرەخات
وەیان کاتێك بە کەسێك ئەڵێیت تۆ هەر خراپیت بڕوا بە قسەکەت ئەکات و ئەڵێی : بەڵێ وام.
ئەو کاتەی کەسێك لە لێوارەکانی نائومێدیدایە بە قسەکانت دەرگای هیوای بە ڕوودا ئەکەیتەوە و دووبارە هەوڵئەداتەوە و ئەوە ئەکات کە دەیویست .
بووە بەکەسێك بڵێی :
ئەتوانیت واز لە گوناهەکانت بهێنیت ؟
پاش ماوەیەك ئەو کەسەت دیبێتەوە کە نوری هیدایەت لە دەست و دڵی ئەڕژێت !
بینیت کە قسەکانمان ئەتوانێت دووبارە ژیان ببەخشنەوە .
یاخود کەسێك تا لێواری مەرگ ببات ؟
هیچ قسەیەك لە هیچ کاتێکدا بە کەم مەبینە .
وشەکانمان هەمیشە کاری خۆیان ئەکەن
لەسەر دڵی ئەوانی تر .





(٩٧)

تۆ کە دڵی کەسێکت بریندار کردو شکاندت.
پێویست ناکات بەرماڵ ڕاخەیت و داوای لێخۆش بوون
لە خودا بکەیت ، بەڵکو دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ لای ئەو کەسەی دڵیت
ئازار داوەو ناخت بریندار کردووە داوای لێبوردنی لێ بکەیت
چونکە حەقی الله جیاوازە لە حەقی الناس ..!



(٩٨)

ئێوارەیەك خودا
لەو سەری ژیانەوە
پڕ بەچاوانت لە شینی ئاسمان و کۆشێ لەئاسۆی پرشینگی خۆر و چەپکێ لە ئەوینی گوڵە پەمەییەکان و باوەشێ لە ئیمانی حەقیقی ئیلاهی و مشتێ لە خۆشبەختی نزاکانی دایکت ئەکاتە چارۆکەکەی پشتتەوە و دانە بە دانە خۆشبەختی لەبەر پێتدا گووڵ دەگرێ .

«تـۆ تە نها سوجدە ببە»





(٩٩)

کاتێك هەمووان دڵت دەشکێنن

تۆ لەم کاتەوە هەنگاو بەرەو خودا بنێ

وازبهێنە لەمرۆڤەکان شەکوای حاڵت لای مرۆڤەکان مەکە بۆت دەبێتە زەلیلی و پەشیمانی دەرگای خوا کراوەیەو سکاڵات بۆ ئەو بەرزکەوە .



(١٠٠)

لە شوێنێك بمێنەرەوە کە دڵت تێدا پێدەکەنێ ..



(١٠١)

لە دونیا نەماوە بەڵام تا ئێستاش بە بەردەوامی گەورەی هەموو دونیایە .

«محمد . صل الله عليه وسلم»





(١٠٢)

ڕۆژێك هەموو برینەکانی ژیان باش ئەبنەوە و ساڕێژ ئەبن ،
بەڵام هەندێ قسەو ڕەفتار هەیە هیچ کات لەبیر ناکرێن ، لەبەر ئەوە نا
کە قسەکەو ڕەفتارەکە ناخۆشە ، نا چۆن کەسێك پێت دەڵێ کە
چاوەروانیت نەدەکرد ،
ڕەفتاری هەندێ لە مرۆڤەکان هیچ کات لە بیر ناچنەوە ..

«محمودی موعەزەمی»



(١٠٣)

چاوەرێ ئەو کاتە بە
کەبە دەنگێکی تێکەڵ لە گریان و پێکەنین دەڵێیت :
خودا وەڵامی نزاکانمی دایەوە و بێئومێدی نەکردم .





(١٠٤)

کاتێك مێشکت فێڵت لێ دەکات و دەڵێ مەحاڵە

دڵت لێت قورس دەکات و دەڵێت ناکرێ .

خودا دەڵێت : {هو علي هين} .

واتە : ئەو کارە لای من زۆر ئاسانە .

خودا هەمیشە ئاگای لێتە ، لەدوای نزاکانت

بیر لەوە مەکەوە خودا چۆن دەیکات ئەگەر بیەوێت شتێك ببێت ،

تەواوی ڕوداوەکانی زەویی و ئاسمان دەگۆڕێت .



(١٠٥)

ئەوەی لە شکست بترسێت باهەرگیز چاوەڕوانی

سەرکەوتن نەبێت ، چونکە سەرکەوتن پڕییەتی لە شکست.





(١٠٦)

سەركەوتوودەبیت سەرەڕای ئەوەی
ڕێگەکە پڕبوو لەکەسانی دووڕوو حەسوود ،
بەڵام تێیاندەپەڕێنیت .



(١٠٧)

«هەر شتێك هۆكاری پێكەنینت بوو بە نهێنی بیپارێزە» .



(١٠٨)

أبو هريرە فەرموویەتی :
نەوەی ئادەم گوێی پڕبێت لەمسی تواوە ، زۆر باشترە بۆیی وەك
لەوەی لە دەنگی بانگ بێت و جوابی بانگەكە نەداتەوە .
مصنف ابن أبي شيبة ( ١/ ٢٠٢) .





(١٠٩)

ئەزانی هیچ کەسێ نازانێ
چەند دەرفەتمان ماوە لە ژیان ،
ئێمە نازانین دواین هەناسەمان لەگەڵ کام ئازاری ژیان کۆتایی دێت ،
دواین زەردەخەنەمان
بە ڕووی چ مرۆڤێکدا دەکەین ،
دواین هەنگاومان ماڵ ئاوای کردن دەبێ لەکام کەسە خۆشەویستەمان .
دواین وشە چ دەبێ کاتێك گوێمان لێ دەبێ ،
تۆ هیچ کاتێك بیرت لەوە کردۆتەوە
ڕەنگە ڕۆژێك بێت وەبێ ماڵ ئاوای کردن هەمووان جێ بهێڵین
چاوەڕێ چیت !؟؟
وەرە لە ئەمڕۆدا ، بۆ خودا بژین
ڕەنگە سبەینێ زۆر درەنگ بێت ...





(١١٠)

خودایە هەر کەسێك بۆ ئێمە هەر شتێکی داواکرد
سەرەتا بەخۆی ببەخشە .



(١١١)

یەکێك لە جوانترین شتەکانی
ژیان ئەوەیە کە تۆ لە خودا دەپاڕێیتەوە و
دەتوانیت هەست بە دڵت بکەیت
کە ئاسوودەیی دەدۆزیتەوە ، جا تۆ هەست دەکەیت کە
خودا گرنگی بەوە دەدات کە ئێوەی نیگەران کردووە ..







(١١٢)

لە (أنس بن ماليك ) ەوە دەڵێت

پێغەمبەری خودا( ﷺ ) ئەفەرمووێی : ئەی کوڕی خۆم

ئەگەر چوویتە ژوورەوە بۆ لای خێزانت سەلام بکە دەبێتە بەرەکەت

بۆ سەر تۆ و ماڵ و مناڵەکەشت .

«صيحيح الترغيب والترهيب (١٦٠٨)».



(١١٣)

«خودایە مەهێڵە هیوایەك لە دڵم بۆ شتێك

دروست بکەم کە بۆ من نەنوسراوە».







(١١٤)

ئارام گرتن شتێك نییە بە ڕوکەش ڕوبدات و دەرکەوێت ،
ئارامگری لە قوڵایی ناخەوە سەر هەڵدەدات .
کاتێك پەیامبەری نازدار (ﷺ) خەمباربوو ،
ئەم فەرمایشتە جوانەی فەرموو :
« چاوەکان فرمێسك دەڕێژن ، دڵ هەست بە خەم دەکات ، وەلێ
زار هیچ شتێك دەرنابڕێت جگە لەوەی پەروەرێن پێی ڕازیە
ئەمە ئارامگرییە .
هەست بە خەمباری دەکات و فرمێسك وەلێ سکاڵا لە
پەروەرێن ناکات . ئەمە مانای ناڕازیبوون نیە ، بەڵکوو وەکو
مرۆڤێك هەست بە خەمی لەدەستدانی ئازیزێك دەکات» ...



(١١٥)

نامەی ئەمڕۆ :
بە ئارام گرتن دەگەیت بە گەورەتر
لەو شتەی خەونت پێوە دەبینی ..





(١١٦)

لە بێدەنگی کەسێك بترسە کە ئازارت داوە
چونکە ئەگەر لە بەرامبەردا هیچی نەکرد و
بێدەنگ بوو ئەوە خوای گەورە دەیکات ...



(١١٧)

ئێستە دەزانم بەختەوەری ڕاستەقینە لەوەدایە
زووتر دەست بەرداری ئەوانە بیت کە ئازارت دەدەن
سەرەڕای ئەوەی کە خۆشیشت دەوێن ..



(١١٨)

دڵ ئازاری پێ گەیشت خوا بە هانایەوە هات ..





(١١٩)

ڕۆژەکەت خراپ دەڕوات ، کارەکەت نایەتە دەست ، پارەکانت بێ بەرەکەت بوون، ناتوانیت بخوێنیت و بێ تەرکیز بوویت ،
هاوڕێکانت کەم کەم خەریکن خیانەت دەکەن ، هەست بە نامۆیی ڕۆژەکەت دەکەیت ..
هەموو ئەمانە ڕوودەدەن کاتێك لاوازیت لە نوێژەکانتدا
کاتێك دڵی مرۆڤێك دەشکێنیت ، کاتێك کاردانەوەیەکی توندت هەیە بۆ شتێك کە شایەنی نییە ، کاتێك نغرۆی لە تاوان .
بۆیە بترسن لەوەی لە نزای تۆڵەی کەسێك بن .
بترسن لەو مرۆڤەی گەردنت ئازاد ناکات ...



(١٢٠)

پەیوەندی حەڵاڵ بە مردن کۆتایی نایەت ئەگەر خوای گەورە بیەوێت لە بەهەشتدا بەردەوام بەبێت ...





(١٢١)

عومەری کوڕی عبد العزیز دەفەرمووێت :

نەگبەتی بۆ کەسێك کە ورگی بوە بە گەورەترین خەمی .

موسوعه ابن ابی الدنیا (٤ _ ١١٧) .



(١٢٢)

جارێکیان عەبدوللە ی کوڕی ڕەواحە ڕەحمەتی الله ی لێبێت گریا !

ژنەکەشی گریا بەدوایدا ..

عەبدوللە وتی : ئەوە بۆچی دەگریت ؟!

وتی : بینیم دەگریت منیش گریام بۆ گریانەکەت .

ئەوپەڕی خۆشەویستییە ...



(١٢٣)

لەیەکێك لە نامەکانی ژیان

بەڵێنێکی مانەوەم دۆزیبووەوە ئەویش بەڵێنی پەروەرێنم بوو.





(١٢٤)

أبو هريره ( رضي الله عنه ) فەرمووویەتی :
هیچ شتێکم نەبینیوە لەپێغەمبەر( ﷺ ) جوانتر بێت دەتووت خۆر بە ڕووخساریدا دەڕوات .

مسند الإمام أحمد ( ٨٩٤٣) .



(١٢٥)

بیسەرە
نزیکتە
وەڵامدەرەوەیە
ئەگەر چی دوای ماوەیەکیش بێت ..
ئەو خودایە ..





(١٢٦)

لەگەڵ خودا دەستپێبکەوە

گرنگ نییە چەنێك دواکەوتووی ..



(١٢٧)

لە نێوان مەحاڵ و بوون دا

فەرمانی خودا هەیە { کن فیکون } .



(١٢٨)

لەبەر ئەوەی خودا پەروەردگارمە

فرمێسکەکانم دەسڕم

ناخۆشیەکانم لە بیر دەکەم

ئارام دەگرم لەسەر برینەکانم

چاوەڕێی خەونەکانم دەکەم

بێ هیوا نابم

لەبەر ئەوەی خودا پەروەردگارمە ...





(١٢٩)

دڵێك تەسلمی « خودا « بوبێت
بەرگەی هەموو سەختیەك دەگرێت ..



(١٣٠)

ڕۆژێکی نوێییە
هەرگیز با ڕۆژەکانت
دووبارە نەبن ، تەنانەت
دووجار خەم بۆ ئازارێك مەخۆ ..
لەجێی
هەر ئازارێك
گوڵێك بڕوێنن ..!

« ئارام ئازاد «





(١٣١)

هەندێ جار دەبێ تەنها بوەستی و هەموو
شتێك جێبهێڵی بۆ خودا ...!



(١٣٢)

ڕۆژێك هیچم نەکرد تەنها قسەکانی دڵم
کۆکردەوە و بۆ خودام باس کرد
ناوم لێنا «نزا»
لەوە زیاتر هیچم نەکرد بەڵام
هەموو شتێکم بە دەست هێنا ...



(١٣٣)

«ئەوەی داوات کرد پێت درا»
خودایە ئەو هەستەش بدە بە ئێمە ..





(١٣٤)

دڵنەوایی ئێمە لە هەموو ماندووبونێکدا ئەوەیە کە
بوهەشت ئەو شتانە چاك دەکاتەوە کە ژیان لە ناوی بردووە ..



(١٣٥)

لە سوجدەیەك هەموویم بە خودا وت
چاوەڕێی ئەو ڕۆژەشم کە بڵێم خودایە بوو ..



(١٣٦)

متمانەت هەبێت
خودا لەوە میهرەبانترە ببینێ دڵت
پەیوەستە بە شتێکەوە و پێتی نەبەخشێ ...





(١٣٧)

کەسانێك هەن دەرمانی دڵن مرۆڤ ئارام دەکەنەوە
ئەگەرچی لەو پەڕی تورەیی و بێ هیوایی بێ
ئەگەرچی نەتوانن لێشت نزیك ببنەوە ...

یان لە نزیکەوە لە باوەشت بکەن هەبوونیان بەسە
هەبوونیان بەسە لە ژیان ئەوەندە جوان لە ناخت ئەگات

یەك وشەی ئەو بەقەد ڕۆمانێ ووشەی ئەوانی تر
دڵت خۆش ئەکات ئەو کەسانە دیارین لەلایەن خالقەوە

بۆیە ئەوکەسانە وەکو پەرچۆ سەیر بکەن با نرخیان بزانین و
لە دەستیان نەدەین چونکێ وەکو بەختن لە ژیان یەکجار دێن ...

«د. مەحمود موعەزەمی»





(١٣٨)

ئیلاهی !
مەهێڵە دوای ڕێگایەك بكەوم تەنانەت ئەتوانم بە تولە ڕێیەکانیشیدا بڕۆم .
تاکە ئومێدی من تۆیت ،
دەزانم بێ ئومێدم ناکەیت .
من هەنگاودەنێم و تۆش ئومێدم پێ ببەخشە ..



(١٣٩)

دکتۆر ئەنوشە دەڵێت :
هەمیشە لە کاتێکدا فشاری ژیانت توند لەسەرە نائومێد مەبە
لەوانەیە خودابێت توند لە باوەشی گرتبێت .
ئارام بگرن بەرامبەر هەر ڕەنجێك كە دەیکێشن
ئاخر ئارامگرتن ، ئەو پەڕی ڕێزگرتنە لە حیکمەتەکانی خودا ..





(١٤٠)

نامەی ئەمڕۆ :

کاتێك سەیری دواوە دەکەیت و ناتەوێت

بگەڕێیتەوە بزانە ڕاست ڕۆشتویت ..



(١٤١)

ئیبن عەباس ئەفەرمووێ :

من نازانم کارێ نزیکترت بکاتەوە لە خوا بە قەد

چاکەکردن بەرامبەر دایکو باوك ..

صحيح الأدب المفرد - ٣٤٨





(١٤٢)

قال رسول الله (ﷺ) :

هەر کەسێك خۆبەکەم زان بێت

بچوکی بنوێنێت بۆ خوای گەورە ئەوا

خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە لەناو خەڵك ..

سلسلة الصحيحة : ٢٣٢٨



(١٤٣)

پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی :

بەڕاستی کەسی وا هەیە بە ڕەوشتە جوانەکەی دەگات بەپلەی ئەو

کەسەی کە بەشەو شەونوێژ دەکات و بەڕۆژ بە ڕۆژوە .

السلسة الصحيحة : ٧٩٥





(١٤٤)

لێم ببورە کاتێك ئەگریم بە هۆی بڕیارەکانت ، سەرەڕای ئەوەی ئیمانم پێتە لێم خۆشبە ئەگەر صە برم نەما ..



(١٤٥)

بەخششی خودا گەورەترە لە حەزو ئارەزووی ئێمە بێتەوە یادت چەندین جار شتێکی سادەت لە خودا داوا کردووە بەڵام باشتری پێداوی !



(١٤٦)

هیچ شتێکی چاك بە کەم مەزانە ، ڕەنگە نرخی شتێکی بچوك لای خودا موعجیزەیەکت بۆ بهێنێتە بوون ...





(١٤٧)

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموویەتی :

هەر کەسێك سەڵاواتێکم لەسەر بدات لە بەرامبەر دا خودا دە سەڵاواتی لەسەر دەدات .



(١٤٨)

ئەگەر شوکرانە بژێربوون بۆتان زیاد دەکەم .



(١٤٩)

زۆر داوا لە خوا بکەن

هەتا خوا بفەرموێت :

پێداویستی بەندەکەم جێبەجێ بکەن

یەقینەکەی زاڵبوو بەسەر قەدەرەکەم .





(١٥٠)

ماڵێك لەسەر بنچینەی دین و ئەخلاق بنیادبرێت
عەجیب چی ماڵێکی دڵ خۆش بێت ..



(١٥١)

ئەگەر لەنێوان تۆ و ئاوات و ئارەزووەکانت تەنها
بە ئەندازەی تاڵەمویەك دووری هەبێت
پێی ناگەیت مادەم حیکمەتی خودا لە بەدەست نەهێنانیەتی ..

وە ئەگەر نێوان تۆ و ئارەزووەکانت دووری نێوان
زەوی و ئاسمان هەبێت پێی دەگەیت ،
ئەگەر خودا ویستی لەسەر ئەوە بێت پێی بگەیت سەرەڕای
دووری و مەحاڵی گەیشتنت پێیان ....





(١٥٢)

ژیان چییە ؟
ژیان بریتیە لە لەحزەکان !
هەناسەیەك دەدەیت و میقدارێك تێدەپەڕێت ،
ژیان ئەوەیە لە نێوان ئەو دوو هەناسەیەدا ، یەکێکیان ڕۆشتوە
و ئەوی دیکەیان دێت و نایەت !

کاك احمدی موفتی زادە



(١٥٣)

ئیمامی بەیهەقی رحمة الله ئەفەرموێ :
هیچ کتێبێك لەسەر قورئان دامەنێ ، وە هیچ پۆشاکێك ،
وەهیچ شتێکی لەسەر دامەنێ بەڵام گەر دوو قورئان هەبوو
یەکێکیان لەسەر ئەوەی تر
دابنەیت دروستە ...

شعب الإمان ٢/٣٩٢





(١٥٤)

ئامینێك لە  ناخی دڵەوە

بۆ هەموو ئەو دوعایانەی کە ڕەوانەی ئاسمانی دەکەن ...



(١٥٥)

خەونەکانت دەکاتە ڕاستی !

کێ ؟

ئەو خودایەی بۆ پێکەنینی گوڵێك

ئاسمان دەخاتە گریان .

«مەولانای ڕۆمی»



(١٥٦)

لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا

خەم مەخۆ بێگومان خوا لە گەڵمانە ...





(١٥٧)

خودا خۆڕاگرییەکەت دەبینێت
دڵشکاوی و خەمبارییەکەت دەبینێت
دەبینێت لە پێناوی ئەودا خۆڕاگربوویت.
مەترسە ،
خەمبار مەبە ،
خودای گەورە ڕزگارت دەکات . . .



(١٥٨)

ئارام بگرە ...
گەر خودا درەنگی خستبێت
جوانتری دەکات ...



(١٥٩)

لە ڕێگەی ئازارەکانتەوە بانگت دەکات
تا بەشێوەیەکی قوڵتر پشتی پێ ببەستی ...





(١٦٠)

قورئان تێکەڵی هەر شتێك ببێت پیرۆزی دەکات

بگاتە هەر تەنگییەك فراوانی دەکات ،

بگاتە هەر تاریکییەك ڕووناکی دەکاتەوە ،

بگاتە هەر تەنیاییەك شادوومانی دەکات ...



(١٦١)

هەرگیزئەوەت بیر نەچێتەوە کە :

هەموو کۆتاییەك سەرەتایی هاتنی شتێکی نوێیە ...



(١٦٢)

ئەو ئارامگرتنەی کە دڵمان بەرگەی

دەگرێت لای خودا ون نابێت ...





(١٦٣)

ئەگەر کەسێك ئازارت بدات لەوانەیە برینەکەت لەبیر بکەیت ،
بەڵام ئەگەر ئازاری کەسێك بدەیت هەمیشە لە
بیرت دەمێنێتەوە .

«خەلیل جبران»



(١٦٤)

«دەرمان نیە بۆ شیفای دڵەکان هێندەی
قورئان بەسوود بێت»..

ابن القيم (رحمة الله تعالى )



(١٦٥)

ساتێك ئارامگرتن لە کاتی تورە بووندا
لەهەزار جار پەشیمانی دەتپارێزێ ...

«ئیمامی عەلی»





(١٦٦)

ژیان قوتابخانەیەکی گەورەیە ، هەر چەند زیرەك و زیرەك بێت دەبێت کارتی مردن بە دەست بهێنیت .



(١٦٧)

پێغەمبەری خودا( ﷺ ) دەفەرموێی :
دووربن لە حەسوودی و بەخیلی ، چونکە حەسوودی چاکەکان دەخوات و لەناوی دەبات وەك چۆن ئاگر پووش و دار لەناو دەبات ..



(١٦٨)

بەدڵ تەنگەکان بڵێن :
موعجیزەکانی خودا لە پڕێکدایە
باوەڕتان بە پلانەکانی هەبێت.





(١٦٩)

هیچ شتێك بەردەوام نابێت تەنانەت دڵی شکاویش
ئەگەر شکاویت ڕوو لە پەروەردگارت بکە و
سەبرت هەبێت چاکت دەکاتەوە ..



(١٧٠)

«وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا» النساء ٧٠
هەر ئەوە بەسە، کەخودا دۆخی بەندەکانی دەزانێت. جابۆیە بێ خەمبە
خودا لە حەقی خۆی خۆشدەبێت بەڵام لە حەقی عەبدەکەی نا. چونکە
إنَّ الله لَا يُخْلِفُ المِيعادْ
بێگومان خودا زاتێك نییە بەڵێنی خۆی نەباتە سەر.



(١٧١)

خودا وەهای تێدەپەڕێنێت
کە تۆ وات دانابوو مەحاڵە ..





(١٧٢)

ویستم بوو بچم گوناحێک بکەم و دوای ئەوە بخەوم
بەڵام بڕیارم دا و قورئانەکەم کردەوە وتم خوایە پەیامێکتم بۆ جێبێڵە پێش کردنی گوناحەکەم چاوم داگرت و پەڕەکانم هەڵەدایەوە پێش و پاشم ئەکرد و دەستم خستە سەر پەڕەیەک سورەتی الرحمن بوو دیسان چاوم داگرت و پەڕەکانم ئەهێناو ئەبرد و دەسم خستە سەر ئایەتێک کە بینیم پەشمان بومەوە لە گوناحەکەم و تەوبەم کرد ئێستا زۆر پەشیمانم ئەمەش ئایەتەکە : كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ (٢٦) دروستکراوەکان لەناو دەچن...



(١٧٣)

هەندێك جار.
گەڕانەوەت بۆ لای خودا .
لەوەوە دەست پێ دەکات کە کەسێك دڵت دەشکێنێت .
یان کەسێکی نزیکت خیانەتت لێ دەکات .
هەتا بێ ئومێد دەبیت لە مرۆڤەکان و پەنا دەبەیتە بەر خودا
ئەویش بێ پێویستت دەکا لە
هەموو جیهان ...





(١٧٤)

نامەیەك بۆ دڵت ..

دڵتەنگ مەبە و زۆر بیرمەکەوە ، سوێند بەو خودایەی کە دروستی کردوم و دروستی کردویت هەموو شتەکانت بۆ ڕێکدەخات و سەرسورمانت دەکات و بە مەرازی دڵت دەگەیەنێت گەشبین بە خودا بە هەموو شتێك بە توانایە و هیچ شتێك لای ئەو قورس نییە ..

سینبت الله مكان الجرح زهرا

خودا لە جێ برینەکانت گووڵ دەڕوێنێت..



(١٧٥)

نوێژ

ئەو ئارامی بەخشەیە

هەندێك کەس لێی تێنەگەشتوون

هەندێکیش پێی نەگەیشتوون ....





(١٧٦)

تەواوی شتە باشەکان لەپاش ئارام گرتن دێن ..

«مەولانای ڕۆمی»



(١٧٧)

وە باشترین شت وترابێ لە بارەی دەستبەرداربوونەوە ئەوەیە :-

وازم لێهێنا بۆ خودا ، تاوەکو خوای گەورە بۆم دەهێنێت ..



(١٧٨)

كن مع يجعلون الطريق الى الجنة أسهل

لەگەڵ ئەوانە بە کە ڕێگای بەهەشتت بۆ ئاسانتردەکەن ...





(١٧٩)

کە بەخودای بسپێری ، چارە دەبێت .

خۆم دیومە ..

کاتێ کە لە هەمووان دابڕاوم چاوی لەسەرم بووە لە بێدەنگی و ئارامیدا کارەکانی نیشان داوم واتە ببینە .. تۆ تەنها نیت

خۆم دیومە ..

کاتێ هەمووان ئەیان وت ئیتر ئەمە کۆتایی ڕێیە ! بە ئیشارەت حاڵی ئەکردم لە دڵی نەگرم تا من نەمەوێت هیچ کۆتاییەك و هیچ دەستپێکی بێ ئیجازەی من سەرناگرێت !

خۆم دیومە ...

کاتێ هەمووان لە هەوڵی خستنە سەر زەویم بوون دەستەکانی دەگرتین و بۆ سەرەوە کێشی دەکردین هەر کات مرۆڤەکان خۆشیان نەویستینایە ئەو خۆشی ویستووم و پڕی کردووم لەو هەستە ئەوێك کە لە دایك میهرەبانتر و لە باوکێك پەناهەندەترە !

وە لە هەر کەس بە توانا تر ....

من کارەکانم بە خودا سپاردووە...

ئەو هەرگیز بەندەکانی نائومێد ناکا !

أليس الله بكاف عبده ؟!





(١٨٠)

توندترین سزای خوا لە دوونیا ئەوەیە خوای گەورە زمانت بێبەش بکات لە زیکرو یادی خۆی ...

«ابن القیم رحمة الله»



(١٨١)

ئیبن عباس (ڕ.خ) دەفەرموێت :
هەر کەسێك گوێ لە ئایەتێك بگرێت لە قورئاندا ، ئەوە بۆی دەبێت بە ڕووناکی لە ڕۆژی قیامەتدا ...



(١٨٢)

شتێکت بیربخەمەوە ؟!
_ خودا خۆشی ئەوێی ...





(١٨٣)

ستەم لێکردن و شکاندنی دڵی بەندەکانی خودایە ..

ئیمامی شافعی دەفەرمووێ :

یارەب ئەگەر ڕۆژێك بومەتە هۆی شکاندنی دڵی بەندەیەکت

ئەوە بەگەورەیی خۆت بمبەخشەو دڵی ئەویش سارێژ بکە ..

السلام علی الذین یعتبرون ...

قلوب الإنسان ودیعة من الله ...!

سڵاو لەو کەسانەی کەدڵی مرۆڤەکان بە ئەمانەتی الله دەزانن ..







(١٨٤)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی :

« مَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ»

کەس بەخششێکی پێ نەبەخشراوە لە سیفەتی سەبرگرتن باشتر و گەورەتر بێت ..

صحيح البخاري ١٤٦٩



(١٨٥)

سەروەت و سامانی دونیا فریوتان نەدات

سەختیەکان عەقیدە و ئیمانتان لەرزۆك نەکات

هەر چۆنێك بێت ئەم دونیایە تێپەڕ دەبێت و دەڕوات ،

ئەوەی تا دوایی لە گەڵتان دەمێنێتەوە کردەوەکانتانە .!





(١٨٦)

ئیمامی شافیعی دەفەرموێت:

ئایەتێکی قورئان هەیە تیرێکە بۆ دڵی هەموو زاڵمێک .!

وە سوکنایی و شیفایە بۆ دڵی هەموو زوڵم لێکراوێک

وتیان چ ئایەتێکە ؟؟

فەرمووی : وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا

واتە : دڵنیابن پەروەردگار هیچی لە بیر ناچێت ..



(١٨٧)

دوونیا دەورانە»

ئەوەی ئەمڕۆ تۆ ئازار بدا ،

بەپێ کات ئەویش هەمان ئازار دەچێژێتەوە ...





(١٨٨)

مرۆڤ وەك ڕووبار وایە
هەتا قوڵتر بێت ئارامترە !

«محمود نامنی»



(١٨٩)

بێدەنگ بە ، ئەوەی نوێژ نەکات کافرە !

«امام احمد بن حنبل»



(١٩٠)

دەرچونی هەندێ کەس لە ژیانت نیعمەتێکە بە
تێپەڕبوونی کات ئەو جا بۆت دەردەکەوێت ....

« د. عبداللطيف أحمد»





(١٩١)

ابن عباس دەفەرمووێ :

پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێ معاذی نارد بۆ یەمەن فەرمووی :

بترسە لە دوعای زوڵم لێکراو ، چونکە بەڕاستی لە نێوان ئەو و خودای گەورە هیچ پەردەیەك نییە ..!



(١٩٢)

چی لەوە جوانترە خودا ڕێکخەری ژیانی تۆ بێت ..!

هەمووی بسپێرە بەو ...



(١٩٣)

ژیانی خۆت بە ئارامی بەڕێبکە ،

گەرچی بارودۆخیشت زۆر ناخۆشبووَ ،

بە زۆر بیرکردنەوە لێی خۆت لە ناو مەبە ..

خودا بە جوانترین شێوە کارەکانت بەڕێوە دەبات ..





(١٩٤)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت :
خوای گەورە زۆر خۆشحاڵە بە تۆبەی بەندەکانی ..



(١٩٥)

فێربە هیچ شتێکت زۆر خۆش نەوێت جگە لە خودا
دەکرێت ئەو شتە ئازارت بدات
بەڵام خودا دڵ خۆشت دەکات ....



(١٩٦)

ژیان ڕێی گەڕانەوەت بۆ ڕابردوو و ڕاستکردنەوەی
هەڵەکانمان پێ نادات .
بەڵام ڕێ دەدا هەر ڕۆژێك باشتر لە ڕابردوومان بژین ...





(١٩٧)

زۆرێك لە خەڵك پێیان وایە هێندە خراپ و گوناهكارن كە ناتوانن لە خودا نزیك ببنەوە ، بەڵام خودا زۆر بەخشندە و میهرەبانە . تەنانەت میهرەبانترە لە دایك...

«لوقمانی حەكیم»



(١٩٨)

لێیان پرسی : نهێنی ئەو دڵخۆشیەی تۆ چییە .؟
زەردەخەنەیەكی كرد و بە چرپەیەكی نەرمەوە وتی : «دووعا» .







(١٩٩)

کوڕم وریابە ! سەبارەت بە داهاتووت بە فیزەوە قسە نەکەیت ، چونکە نازانیت لە داهاتووتدا چی ڕوودەدات .
هەروەها هەرگیز وەسفی خۆت مەکە و تا پێت دەکرێت هەوڵ بە بە چاکەکردن وا لە خەڵك بکەیت ئەوان وەسفی تۆ بکەن ..

«لوقمانی حەکیم»



(٢٠٠)

لەپشت هەموو دواکەوتنێکەوە خێرێك هەیە ،
ئێستا نا لە کۆتایدا هەستی پێ دەکەین ...







(٢٠١)

خەتەرترین مرۆڤەکانی سەر زەوی ، درۆزنەکانن . !

«غاندی»



(٢٠٢)

لە گرتنەوەی ڕێگای حەق مەترسە ،
تەنانەت گەر بە تەنهاش بوویت ..

«ئیمامی عەلی»



(٢٠٣)

یەکێك لە موسیبەتەکانی دونیا ئەوەیە ،
بێ ئەدەب پێی وایە کەسایەتیەکەی زۆر بەهێزە .

«عبدالرحمن معیذر»





(٢٠٤)

خۆش بە حاڵی کەسێك
کە شەوی ئەنگوستە چاوی بە دیداری نوورینت ڕوناك دەکاتەوە .

پڕ هیوا کەسێك
کە گرێی دڵی دەخاتە سەردەست و بەڕێی ئاسمانی دەسپێرێ .

ئاسوودە کەسێك
کەتاڵی فیراقی لە هەنگوینی لێخۆش بوونتدا دەتوێنێتەوە .

بەشایستەمان ببینە و دڵ و فکر و جەستەی شەکەتمان
بە میهرت پاڵفتەی ئارامی بکە ...

یارب ....







(٢٠٥)

لەوانەیە ئومێد لە لاپەڕەی کۆتایی بێت

بۆیە کتێبەکە دامەخە



(٢٠٦)

ڕەنگە هەموو شتێکت لە دژ بوەستێتەوە و تەنیا خودات لەگەڵ بمێنێتەوە ،
هەر ئەو بەسە ، لەگەڵ خودا بمێنێتەوە هەموو شتێك بۆ مەیسەر دەبێت .!

«سەلاحەدینی ئەیوبی»







(٢٠٧)

ئیلاهی ،

لەگەڵم بە ،

هەمووان دەڕۆن ،

ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها زاتی تۆیە ..

إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ «شعراء ٦٢»



(٢٠٨)

جێگا بەتاڵەکانی ناخت بە کەسانی هەڵە پڕمەکەوە ...



(٢٠٩)

الشیخ صالح الفوزان (رحمة الله) دەڵێت :

دوعا و پاڕانەوە کلیلی گەنجینەکانی خوای گەورەیە، ئەگەر دەتەوێت گەنجینەکانی خوای میهرەبان بکەیتەوە ، دوعاو پاڕانەوەکانت زیاد بکە..





(٢١٠)

پێتوایە دوای ئەم هەموو سەبرە ،
خودا دڵتەنگت بکات ؟
نەخێر، بەخوا ، ئەوەی ئاواتی بۆ دەخوازیت لەوە
باشتر و زیاتر لەوەشت پێدەبەخشێت ...



(٢١١)

بەڵێنی شتێك بە کەس مەدە کە ناتوانی ئەو بەڵێنە بەریتە
سەر هەندێك لە دڵەکان پەیوەست ئەبن بە وشەکانتەوە .



(٢١٢)

كن لطيفا رحيما مع كل شيء يتنفس
باش بن و بە ڕەحم بن لەگەڵ ئەو شتانەی هەناسە دەدەن..





(٢١٣)

دوو قسەی زۆر جوانی ابن قیم دەربارەی نزا ( دووعا ).

ابن قیم فەرموویەتی : ئەگەر پەروەرێن ویستی هەبوایە نزاکانتان قەبوڵ نەکات ، هەرگیز هیدایەتی نەدەدان نزابکەن .

لە وتەیەکی دیکەیدا فەرموویەتی : هەرکەسێك هیدایەت درابێت نزا بکات ئەوا پێشتر وەڵامێك بۆ نزاکەی دانراوە ، چونکە خودا دەفەرموێت : «بانگم بکەن وەڵامتان دەدەمەوە».



(٢١٤)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت :

من گەرەنتی ماڵێك لە بەهەشت دەکەم

بۆ کەسێك وازبێنێت لە مشتومڕ و موناقەشە

ئەگەریش لەسەر حەق بوو.





(٢١٥)

خووە خراپەکان

ئێوە دەکەنە بەندەی خۆتان ..



(٢١٦)

مرۆڤەکان لاوازترینی سەر زەوین

زوو دەگرین

زوو دڵتەنگ دەبن

زوو دڵخۆش دەبن

زوو تورە دەبن

زوو ئاشتدەبنەوە

زوو هۆگرەبن

زوو بیریان دەچێتەوە .

ئێمە بەبێ خودا کێین ؟





(٢١٧)

هەر کەسێك لە خودا نزیك بێت

لەبەرچاوانیش جوان ئەبێت زۆریش دەچیتە دڵەوە ...



(٢١٨)

دڵ تەنگ مەبە بەوەی بەرامبەرت

دەکرێت هەمووی لێپرسینەوەی لەسەرە ...



(٢١٩)

سەرەڕای هەموو ئەو کێشە و ئازارانەی هەمە دڵخۆشم چونکە

خودا ئاگای لێمە ، پشتم لێناکات ، وازیشم لێنایەنێت

خودایەکم هەیە هەمیشە ،

پشتیوانمە الحمد لله کە هەست بەبوونت ئەکەین پەروەرێنم ...





(٢٢٠)

زۆر جار مرۆڤ

پێویستی بە ئامۆژگاری نیە پێویستی بە یارمەتی نیە

تەنها پێویستی بە کەسێکە گوێ لە وشەکانی ناخی بگرێت...!!



(٢٢١)

پەیوەندیەکانتان حەرام بوون

بۆیە خودا دڵی ئێوەی شکاند ...



(٢٢٢)

لەدوای چەندین ساڵ بۆت دەرەکەوێ ،

ئەو دەمەی خودا ئەو شتەی لێ گرتیتەوە کە زۆر خۆشتدەویست ،

تەنها بۆ ئەوە بووە بە جوانتر لەوە قەرەبووت بۆ بکاتەوە و ،

دڵت ڕازی بکات .

متمانەت بە خودا هەبێت ..





(٢٢٣)

ابن القيم رحمة الله دەفەرموویت :

ئەگەر پەروەردگار لێت بورا ، پێداویستیەکانت جێ بەجێ دەکات

بە بێ پاڕانەوە .

چونکە ئەو خودایە».



(٢٢٤)

کوڕی خۆم زۆر بیربکەوە و کەم قسەبکە مەگەر

لە وتنی ڕاستیدا نەبێت ، زۆر بگری و کەم پێبکەنە ..

«لوقمانی حەکیم»



(٢٢٥)

هەتا کاتێك هەوڵت دا و ئەنجامەکەیت نەبینی

پاداشت دەدرێیتەوە لەسەر هەوڵدانەکەت ..!

شەرمەندەین لە ئاست تەمەڵیمان خودای بە ڕەحم .





(٢٢٦)

ئەوەندە شکۆو پایەداریت بەسە کە تۆ بەندەی ئەویت ..

ئەوەندە فەخرو شانازییشت بەسە ، ئەو پەروەردگاری تۆیە ..

«ابن القیم الجوزی»



(٢٢٧)

هیچکات ئەوەندە بە کەسێك متمانە مەکە

کە کاتێك ڕاستەقینەکەیت بینی نەتوانی باوەڕ بکەی ...



(٢٢٨)

هۆکارێك بە کە مرۆڤەکان باوەڕبکەن هێشتا باشی بوونی هەیە ..







(٢٢٩)

دوای ئازارێکی زۆر و دڵتەنگییەکیەکی بەردەوام و هەوڵی زۆرم بۆ ئەوەی ئەو شکانەم چاک بکەمەوە .

لە پڕ دووبارە نەکەومەوە هەمان ئەو ڕۆژانەی کاتە گرنگەکانی ژیانم تێیدا بە فیڕۆ دەدا بەهۆی بێهێزی و شکانی هەستەکانمەوە پاش . ئاوڕدانەوەم دەبینم لە لوتکەدام لەگەڵ خوادا دواتر بڕوام بەو قسەیەی پیاوە ئاینییەکان هێنا کە دەڵێن :

خودا بۆ ئەوەی بەندەیەکی لە خۆی نزیك بکاتەوە دڵی دەشکێنێت ..

ئێستا چیتر ئەمە تەنها شتێك نییە کە بیستبێتم

بەڵکو ئەزمونم کردووە تێیدا خودام دۆزییەوە ..







(٢٣٠)

هەر کەسێك پەروەردگار بناسێ
ئەو ناسینە بە شێوەیەك سەرقاڵی دەكات ، نایپرژێتە
سەر شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوەکانی ..

«ابن القيم الجوزی»



(٢٣١)

وەك ئەوەی زەوی ماندوو بوبێت و چیتر توانای
هەڵگرتنی گوناهـ و تاوانەکانمانی نەمابێت ...
رَبنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ...



(٢٣٢)

ئازاری هیچ کەسێک مەدەن
چونکە داوای لێبوردن کردن ناتوانێ کاریگەری برینەکە بسڕێتەوە ..





(٢٣٣)

وونبوونەکان درێژە دەکێشن ..!!
تامەزرۆییەکانیش هەرزیاد دەکەن بۆ دیدار
ئومێدبوون بە الله لەهیچ شتێکا شکست ناهێنین ، و ئارام دەگرین بەبێ
شەکوا لەهەموو بارۆدۆخێکدا ان شاء الله تعالی
نەدینەکەمان تەمبەڵی و لاوازیمان قبوڵ دەکات نە ژیانیش ، دەبێت
هێزێکمان هەبێت بەهیچ ڕەشە باییێك نەکەوین نەڕوخێین..
وەنابێت بترسین لەهیچ قەدەرێک و پێشهاتێک کە الله خۆی بۆی
داناوین بێتە ڕێگامان..
دڵ و ڕۆح ئۆقرە دەگرێت کاتێک
الله سبحان وتعالی دەفەرموێ
( قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسمَعُ وَأَرَىٰ ).
خوا دڵنیای کردن و فەرمووی : مەترسن بەڕاستیی من لەگەڵ ئێوەم
هەموو شتێک دەبیسم و هەموو شتێکیش دەبینم ..







(٢٣٤)

مەخلوق ئەگەر لێی ترسای ، لێی ڕادەکەیت و دوردەکەویتەوە ، پەروەردگار ئەگەر لێی ترسایت و سام و هەیبەتت لێی کرد ، هۆگری دەبیت و لێی نزیك دەبیتەوە .

«ابن القیم الجوزی»



(٢٣٥)

«بەردەرگای ماڵەکانتان پاک بکەنەوە چونکە جولەکەکان بەردەم ماڵەکانیان پاک ناکەنەوە»

«طَهِّرُوا أفْنِيَتَكُمْ فإِنَّ اليهودَ لا تُطَهِّرُ أفنِيَتَها»

حكم المحدث: حسن

الراوي: سعد بن أبي وقاص

المصدر: صحيح الجامع الجزء أو الصفحة : ٣٩٣٥





(٢٣٦)

مردنیش تێدەپەڕێت
ناوگۆڕیش دەبینین
دەگەینە قیامەتیش
تەنها پەشیمانی دەمێنێتەوە بۆکەسێك کە خودای
لەخۆی ڕازی نەکردبێت ..
رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّار.



(٢٣٧)

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ
(الحجر آية ٧٧) ..
بەڕاستیی لەو دەست وەشانەدا نیشانەیەکی گەورەی دەسەڵاتی خوا هەیە بۆ بڕواداران ..
«Indeed in that is a sign for the believers.»





(٢٣٨)

خوای گەورە دەفەرمووێ : نزل به الروح (الأمين) .

.واتە: جبریلی دەستپاک و ئەمین هێنایە خوارێ

کەواتە : ئەم قورئانەش تەنها کەسانێک شەڕەفی هەڵگرتنیان پێ ئەدرێ

کە ئەمین بن

لا ينال شرف حمل القرآن حقا إلا الأمناء..

«د.عبدالله بن بلقاسم»



(٢٣٩)

دەزانی ئاواتی مردووەکان ئەوەیە بگەڕێنەوە

بۆ دونیا و بۆ تەنها جارێک بڵێن ...

أستغفرالله واتوب إلية ..





(٢٤٠)

بگری گەر کەسیش نەبێت لە یاوەشت بکات

دواتر فرمێسکەکانت بسڕەوە بەهێزیت ، دەتوانیت هەموو ناخۆشیەك تێدەپەڕێنیت تەنها پشت بە خودا ببەستە، ژیان سەختە بۆ هەمووان بەڵام دەبێت ئارامت هەبێت ...



(٢٤١)

دوای هەر ناخۆشی و ناڕەحەتیەك بێگومان هیچ کوێمان نەبێ پشت بەخودا دەبەستین هەر خوایە بەهێزمان دەکات و هەمیشە لە گەڵمانە سەبرمان پێ دەدات بۆیە پشت بە خودا هەموو شتێك تێدەپەڕێ ...







(٢٤٢)

خودایە ئەوەی لەناو دڵی ئێمەیە لەژێر دەستی تۆیە
ئەوەی لای ئێمە قورسە لای تۆ ئاسانە
ئەوەی لای ئێمە مەحاڵە لای تۆ تەنها بە (کن فیکون) دەبێ
خودایە گیان ئاسانییەک بۆ قورسەکانی ئێمە
( کن فیکون ) ێك بۆ مەحاڵەکانی ئێمە ..
ئامین پەروەرێنم ....



(٢٤٣)

ئەی کوری شیرینم
هەموو هەوڵێکت لە چاکەدا با بەزۆر لە خۆکردن
بێت و هەرگیز مەڵێی بەسە ..
«لوقمانی حەکیم»

(٢٤٤)

هەمیشە لەبیرت بێت ..
«خودا کەس لە تۆ دوور ناخاتەوە ، تەنها لەبەر خاتری تۆ نەبێت».





(٢٤٥)

عبداللەی کوڕی إمام أحمد « رَحِمَهُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ » دەفەرمووێت :
الصبر نیوەی ئیمانە، یقین تەواى ئیمانە .

«السنة لعبدالله بن أحمد ١/٣٧٤»



(٢٤٦)

هەر کەسێك باسی خەڵکی
بۆ هێنایت ، دڵنیابە باسی
تۆش بۆ خەڵکی دەبات ..

«ئیمامی شافعی»





(٢٤٧)

ئێمە لاوازین !

لاوازی ئێمە لەکەمی بیرو باوەڕەوە سەرچاوەی نەگرتووە ،

بەڵکو ژیان ڕەق و ناخۆشە ..

ڕۆژێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە تائیف بوو ،

خۆ بیروباوەڕی لاواز نەبوو ..

بەڵام ژیان زۆر ڕەق و دژواربوو خوای گەورەش دەیزانی پێغەمبەرەکەی چەندێ خەمبار و دڵشکاوە ، بۆیە بە هیچ جۆرێ سەر کۆنەی نەکرد و تەنانەت گلەیشی لێ نەکرد ...

«ئەدهەم شەرقاوی»



(٢٤٨)

لەواتای ئەوە تێدەگەیت :

بخەویت و لەبەر خۆتەوە بڵێیت :

خوایە ، یارمەتیم بدە ئەم ڕۆژانە تێپەڕێنم ؟





(٢٤٩)

تەنانەت ئەگەر ئاسمانیش دوور دەرکەوێت
ئەوەی لە سەرووی ئاسمانەوەیە زۆر لێت نزیکە
برینەکانت بە دووعا و پاڕانەوە سارێژ دەکات ..



(٢٥٠)

کاتێك پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب وەفاتی کرد
سەعیدی کوڕی زەید زۆر گریا پێیان گوت بۆچی دەگریت ؟
گوتی : بۆ ئیسلام دەگریم ، گوزەرێکی بەرکەوتووە تا
ڕۆژی دوایی شوێنەواری دەمێنێت ..

«الطبقات الکبری لابن سعد ، ج ٣ ، ص ٢٧٢»







(٢٥١)

هەمیشە بە جۆرێك بژی کە
چاوەڕێی هەموو شتێك لە مرۆڤەکان بکەی بێجگە لە خۆشویستن ..
هەرگیز مەڵێ ئەمە جیاوازە ئەو خۆشەویستمە یان هاوڕێمە .
کەس جیاواز نییە کامەت پێ ئازیزە چاوەڕێی خراپترینی لێبکە ..!



(٢٥٢)

پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی : هەر کەسێك پێی خۆشە تەمەنی درێژ بێت و ڕزق و ڕۆزی زیاد بێت ، ئەوا با چاکەکار بێت لەگەڵ دایك و باوکی وە پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت .

«رواه أحمد (صحيح الترغيب ٢٤٨٨)»



(٢٥٣)

ئەوەی مرۆڤەکان بناسێت تەنها دەبێت ..

«ئیمامی عەلی»





(٢٥٤)

حتضن مُصحفك فَنحن قومٌ بالقرأن نتنفس ..

قورئانەکەت لەباوەش بگرە ئێمە

قەومێکین بەقورئان هەناسەئەدەین..



(٢٥٥)

ئیسلام

ڕۆژەکان نایگۆڕێ ئەوەی ئێوارە حەرام بوو

ئەمڕۆ و بەیانیش حەرامە ...



(٢٥٦)

ئەگەر دڵەکان لێك نزیك بن دووری جەستە کێشە نییە ..

«ابن القیم»





(٢٥٧)

دینێك كە ڕێگەم پێنەدات ئاوی زیادە بڕێژم

چۆن ڕێگەم پێدەدات خوێنی خەڵك بڕێژم ..

«د. زاكير نايك»



(٢٥٨)

مطرف بن شخير دەڵێت : هەر کەسێك لە ئێوە پێویستیەکی هەیە با لە کاغەزێکدا بۆم بنوسێت ، چونکە پێم ناخۆشە زەلیلی پێداویستی لە ڕووی براکەمدا ببینم ...

«ریسالەی قوشەیری»



(٢٥٨)

ژیان هیچکات ئاسانتر نابێت ، تۆ بە هێزتربە ...





(٢٥٩)

خودا لە شوێنێك کەهەر بەبیریشت دانایەت دەرگایەکی گەورەت بۆ دەکاتەوە ، کەباوەڕت وابوو هیچ لەژێر دەستی ئەو دەرناچیت و یەقینت بێت وەڵامت دەداتەوە ،

ئەوا بەجۆرێك گورزی خۆی ئەدا لە ناڕەزییانی کاری تۆ و ڕێگرانی ویستی تۆ بەدوو پیتی کاف و نوون هەڵئەگێڕێتەوە ،

بەتۆ و هەموانی پیشان ئەدات ئەوەی باوەڕی بەدەسەڵاتی ڕەها و بێ هاوتای خودای خۆی هەبێت .

خوداش تەسلیمی ئەو دەسەڵاتەی ئەکاتە ڕوناکاری ڕێگاکەی و هەموو شتێکی بۆ دەکات ،

چونکە لەهەر کەس نائومێد بووە بەڵام لە خودای خۆی نا .

ئەزیز گیان ..!

مادام خودایەکی هێندە بەدەسەڵاتت هەیە بۆ وازهێنان یەکێکە لە بژاردەکانت ..؟

لەبری ئەوە یەك وەڵام هەیە ئەویش

{ کن فیکونی } ..

خودایە لەکاتی گونجاوی خۆیدا ...





(٢٦٠)

لەم ڕۆژگارەدا ،
کە ئێمە زیاتر لە هەر شتێك
پێویستمان بە ئومێد و باوەڕە مەهێڵە نائومێدی
هێندەی سەرە دەرزییەك ..
دەلاقە لە دڵتدا پەیدا بکات و لەوێوە هێرش بهێنێت .
ئومێدیان بۆ ڕۆژانی سەخت چێ کردووە چرا بۆ تاریکایی .
مرۆڤ ئەگەر لەتەك کوێرەوەری و ژان و بەڵادا
ڕوبوڕوو نەبوایەتۆ نە بە شتێك باوەڕی دەهێنا ،
نە بە داهاتوویەك دڵی دەبەست و نە لە هیوایەکیش ،
چەکێکی دروست دەکرد بە خۆڕاگریی کێو ..

«نادر ئیبراهیمی»







(٢٦١)

[سَيَجعَلُ اللَّهُ بَعدَ عُسرٍ يُسرَا]

دڵنیابن خودا دوای نارەحەتی ، خۆشی دەهێنێت ..



(٢٦٢)

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی :

ئایا پێت خۆشە دڵت نەرم بێت و پێویستییەکەت بێتە جێ ؟

بەزەیت هەبێت بەرامبەر هەتیو وە دەست بهێنە بە سەریدا

دڵت نەرم دەبێت و پێویستییەکەت جێبەجێ دەبێت ..

السلسة الصحيحة برقم (٨٥٤) ..



(٢٦٣)

ئەوەی لای تۆ مەحاڵە ، دێتە دی پشت بە خودا ببەستە ..

ما هو مستحيل بالنسبة لك سوف يتحقق ثق باالله .





(٢٦٤)

شەونوێژ جیهادە جیهادیش پێویستی بە کەسی تەمەڵ و ترسنۆك نیە تا تێیدا بە ژدار بێت ..

«ابن جوزي»



(٢٦٥)

ئێمە بەڵێنی ژیانێکی بێئازارمان پێ نەدراوە :
ئێمە بەڵێنی گەشتێکی بێ ، شەپۆڵمان پێ نەدراوە .
ئێمە بەڵێنمان پێ دراوە ئەگەر دەست بگرین بە فەرمانی خوداوە
و لەبەلەمی ڕزگاری یادکردنی نزیکی و ڕەحمی ئەوەدا بمێنیەوە
شەپۆلەکان دێن
بەڵام هەرگیز و هەرگیز نوقممان ناکەن ..





(٢٦٦)

شەرمنە بەڵام ئەزانێت چ کاتێك بوێر و چاو نەترس ئەبێ ئەمە بەهێزترینی ئافرەتەکانمانە ..



(٢٦٧)

بەردەوام بیر لەو قسانەی خودا بکەوە کە دەفەرموێت :

تۆم دروستکردووە بۆ عیبادەت

یاری مەکە

وە من ڕزق و ڕۆزیتان دەدەم

ماندوو مەبە

وە سوێند بەشکۆمەندی و گەورەیی خۆم

ئەگەر ڕازی بیت بەوەی پێم بەخشیویت

ئەوا بۆت زیاد دەکەم ...

نزاکانتان خودا بەڵێنی گیرابوونی داوە





(٢٦٨)

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دوعا دەکەیت

ئەو دوعایانەی بەردەوام دەیڵێیتەوە ،

ئەو دەمەی بە بێدەنگی لەسەر سەرینەکەت دەگریت ..

هەموو ئەوانە بە هەوانتە ناڕوات ،

خودا قەرەبووی هەمویت بۆ دەکاتەوە ،

ترسەکەت دەگۆڕێ بۆ ئارامی ،

هەموو بونت پڕدەکات لە یەقین ...

خودا پاداشتی خۆڕاگریەکەت دەداتەوە ،

پاداشتی هەموو ئەوانەی ئازاری گەیاند بە ڕۆحت ..

هەمیشە بیرت بێت ئەو دەمەی خودا پێت دەبەخشێ ،

شۆکت دەکات و ڕازیت دەکات ...

«رهان العوران»







(٢٦٩)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت :

نزیکترین کات کە بەندە لە خودای خۆی نزیك بێت ئەو کاتەیە کە لە سوژدەدا بێت ، کەواتە لەو کاتەدا زۆر بپاڕێنەوە ..

«رواه مسلم ٤٨٢»



(٢٧٠)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت :

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت : هەر بەندەیەك عەیب و ناتەواوی بەندەیەك داپۆشێ لە دونیا ئەوا خوای گەورە لە قیامەتدا عەیب و نا تەواوی ئەو بەندەیە دادەپۆشێت.

«رواه مسلم ٢٥٩٠»



(٢٧١)

نامەیەك بۆ تۆ

خودا هەرگیز وازت لێ ناهێنێت ...

ئەو گۆڕانکاریانەی حەزدەکەیت لە خەڵکیدا بێتە ئاراوە ،

سەرەتا دەبێ لە خۆماندا دروستی بکەین ..





(٢٧٢)

نیعمەتێکی جوان لە ڕۆژە سەختەکانتدا هەیە ،
پێویستی بە ئیمان و سەبرگرتنە ..



(٢٧٣)

گران بە
بهێڵە مرۆڤەکان
بەهایەکی قورست بۆ بدەن
ئاخر ئەوان فێرن
شتی بەلاش بە بەلاش لە دەست دەدەن ..

«علی شەریعەتی»



(٢٧٤)

تا نزیك تر بیت لە خودا نزیکتری لە بەختەوەری ..





(٢٧١)

من لە ئازارەکانت تێدەگەم .

لەوەی کە هیچ شتێك ئەو دڵەت ئارام ناکاتەوە

بەڵام دەشزانم کە خودا ئاگای لێتە و بۆ بارودۆخت قەرەبوت دەکاتەوە .

تۆڵە لەوانەش دەکاتەوە کە هۆکاری ئەم حاڵەی ئێستای تۆ بوون .

متمانەم پێتە ئەم ڕۆژانەی دادێ باشتر دەبیت

ئەوەی دێتە ڕێگەت هەمیشە باشتر دەبێت

ئەوەشی لە ژیانت دووردەکەوتەوە دیسان باشتر دەبێت

وەك ئەوەی هەندێك جار ڕاستییەکە ئەوەیە ئێمە لە دووری یەك نین

ئێمە ئەوەمان نەبێت .

ئێمە هەرگیز ئەوە نەبینین کە دەمان ویست

ڕاستییەکە تۆش لەو باشییە تێناگەیت

هەتا کات بە شوێنێکت دەگەیەنێ و پێت دەڵێ :

لەبەر ئەم خراپییانە بوو تۆم ڕووبەڕویان نەکردەوە

ئەو کات تۆش سوپاس گوزار دەبیت ...





(٢٧٢)

ئەگەر یەکێك دڵنیابوو لەدڵت ، دڵنیا دەبێت لە لێخۆشبونت ،

ئەگەر دڵنیاش بوو لە لێخۆشبوونت زۆر بێ بەزەییانە ئازارت دەدات ..



(٢٧٣)

«وَ آتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ»

هەموو ئەو شتانەتان پێدەبەخشم کە داوای دەکەن..

فریشتەکانم ، ئەمشەو پێویستی بەندەکەم جێبەجێ بکەن ،

چونکە یەقینەکەی بەسەر چارەنووسی مندا زاڵ بووە..





(٢٧٤)

ماندوو و بیر ئاڵۆزم خودایە تۆ دەمبینیت چەندە بە سەختی

هەوڵدەدەم ، دەمبینیت ڕوبەڕوی چی دەبمەوە

دەپاڕێمەوە ئاگادارم بە ، لە هەموو

هەنگاوێکدا پێویستیم پێتە بێ ڕەحمی خۆتم مەکە ،

تۆ تاکە ئومێدی

هەمیشەیی منیت تەنهام مەکە لەنێو ئەم هەموو سەختیەدا....



(٢٧٥)

خەیاڵی زۆرمان کردوو نەبوون بە ڕاستی

وەلەو من هێشتا دڵخۆشم ، هەر ئومێدم هەیە

بە خودا کە ڕۆژێک یەت گەر ئەو خەیاڵانەش نەبێ

لەو جوانترم پێ ئەبەخشێ ئەمە دڵدانەوە نیە ،

بەڵکو بەڵێنی پەروەردگارە...





(٢٧٦)

ئەو فرمێسکانەی
پێش ئەوەی بکەونە خوارەوە وشک بوونەوە ،
پێش ئەوەی هیچ کەسێک بیبینێت ،
پێش ئەوەی بدات لە ڕووخسارت و شوێنەکەی دیار بێت ،
دڵنیابە خودا بینویەتی و هۆکارەکەی زانیووە و
ئەوەی بۆ داناویت کە دڵت خۆش دەکات و چاوگەش دەبیت .
خودا ئەوە دەزانێ کە دەرت نەبڕیووە ،
ئەو دوعایەی بۆت نەکرا بە وشە و نەتوانی بیڵێیت ،
ئاگای لەنرکە نرک و ململانێکانتە ..
ئەگەر دەتەوێت ئەم ئایەتە بخوێنەوە :
« وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١٣)
أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ (١٤) .»
واتە : ئێوە قسە بە پەنهانی بکەن یان بە ئاشکرا
بۆ خوا یەکسانە چونکە خودا ئاگادارە بەخودی (نهێنی) دڵان ،
ئایا ئەو خوایەی کە ، مەردوومی دروست کردووە ئاگای لە نهێنی یان نییە
لە کاتێکدا کە ئەو وردبین و ئاگادارە ..





(٢٧٧)

ئیبن موسەیب لەهۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتانەدا دەڵێت :
پیاوێک لە شەوێکی تاریکدا لەنێو کۆمەڵێ داردا وەستابوو،
بایەکی زۆر توند هەڵیکرد، لە نەفسی خۆیدا وتی :
تۆ بڵێی خودا لەم تاریکیەدا ئاگای
لە کەوتنی ئەم گەڵایانە بێت ؟!

بە دەنگێکی مەزن بانگی کرا :
﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾

ئەو زاتەی ئاگای لەدڵتە فەرامۆشی ناکات ، بەزایەی نادات ،
گەرچی نەتوانی بە جوانی دوعاکانت بکەیت و
سکاڵای خەمەکانت بکەیت ،
هێندەت بەسە کە خودا ئاگاداری نهێنیەکانتە..





(٢٧٨)

چەندی جوانە کە خەمێکی گەورە لە دڵی خۆتدا پشتگوێ بخەیت و بڵێی قەدەری خوایە و هەرچیەکی بیەوێت ئەبێت ...



(٢٧٩)

سەیری دواوە مەکە نایەتەوە ،
سەیری داهاتووش مەکە هێشتا نەگەیشتووە
ئێستا بژی ئەوەی دیکە بدە دەست خودا ..



(٢٨٠)

خودا هەمیشە و لە هەموو شوێنێ لەگەڵتە ..





(٢٨١)

نازانی چی ساتێک پێت ئەوترێت

(قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ ) (طه - ٣٦)..

واتا : بەڕاستی ئەوەی داوات کرد پێت درا



(٢٨٢)

عبدالله ی کوڕی إمام أحمد « رَحِمَهُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ » دەفەرمووێت :

الصبر نیوەی ئیمانە، یقین تەواوی ئیمانە..

السنة لعبدالله بن أحمد ١/٣٧٤





(٢٨٣)

شێخ عبدالرزاق البدر ـ خودابیپارێزێت ـ دەفەرمووێت :
لەبەهەشت دا ماڵێک هەیە پێ دەوترێت ، ماڵی [ الحمد ] تایبەت کراوە بەوکەسانەی لەخۆشی و ناخۆشی سووپاسی خودا دەکەن وە ئارام دەگرن لەسەر تاڵی و ناخۆشی ئەوەی بەسەریان دێت لە قەزاوقەدەردا...

الحَمْدُ لِلّٰهْ عَلَى كُلِّ حَال



(٢٨٤)

خودایە
هەنێك جار دونیا و نامەردییەکان دەرد بۆ دڵم دێنن
بەڵام هێزی ئومێدی تۆ لە چاوەکانم نارۆن
باش دەزانم ئاگاداری دڵمیت
تاکاتێك تۆم هەیە غەمێك نیە
هەبوونی خودا کارێکی کەم نیە ...





(٢٨٥)

گەر زۆر زۆر حەزت دەکرد شتێک بەدەست بهێنیت ..
زۆر داوا لە خودا بکە و بڵێ خودایە دەسەڵاتی خۆتم نیشان بدە
لە نێوان بانگ و قامەت
لە نیوەی شەودا
لە دوای نوێژەکان
ئەم دووعایە بڵێرەوە . پاشان ببینە خودا چۆن وەڵامت دەداتەوە
متمانەم پێ بکە خودا هەرگیز شەرمەزارت ناکات .
من لە بارەی خوداوە بۆتان دەدوێم



(٢٨٦)

ابن تیمیه رحمه الله دەفەرمووێت :
ئەوەی پەنا بۆ جگە لە الله دەبات
وەکو خنکاوێکە پەناو هاوار بۆ خنکاوێکی تر دەبات .





(٢٨٧)

أبو دەرداء « رضي الله عنە « فەرموویەتی : « هەمیشە سوور بن لەسەر دوعاکردن ، چونکە هەرکەسێك زۆر لە دەرگایەك بدات لە داهاتوویەکی نزیکدا دەرگاکەی هەر بەڕوودا ئەکرێتەوە..

الله المستعان.. [ المصنف : ٦ ـ لا ٢٢ ]



(٢٨٨)

ئێمە لە زەمەنێکداین هەرچی تاوانە تێیدا کۆبۆتەوە ،
کوفر و شرکی قەومی نوح ،
بەدڕەوشتی قەومەکەی لوط ،
فرت و فێڵی پێوانە و دارایی قەومی شوعەیب ،
هەبونی دەسەڵاتداری زاڵم و خوێنڕێژی
وەك فیرعەون و قارون .
هێشتاش الله تعالی ڕەحمی پێمان کردوە و سەلامەت لەسەر زەوی دێین و دەچین ..





(٢٨٩)

زۆر بەداخەوە .!

ئەوەنەی لە عەیبە دەترسین لە تاوان ناترسین

ئەوەنەی لە درووستکراو شەرم دەکەین

لە درووستکار شەرم ناکەین ...



(٢٩٠)

ئەكثەمی كوڕی صەیفی « رَحِمَهُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ » دەفەرمووێت :

چاوپێکەوتنی خۆشەویستان دەبێتە هۆکاری ڕەوێنەی خەمەکان..

«الإخوان لابن أبي الدنيا ١٤٤/ ١»







(٢٩١)

پێغەمبەری خوا «ﷺ» دەفەرموێت :

خۆشترین ئاخاوتن لەلای خوای گەورە بریتیە لە

سُبْحَانَ اللّٰه

وَالْحَمْدُ للّٰه

وَلَاْ إِلَـهَ إِلَّاْ اللّٰه

وَاللّٰهُ أَكْبَر

«صحيح مسلم ـ ٢١٣٧»



(٢٩٢)

سوێند بە خودا :

هەر پەیوەندییەك سەرەتاكەی خودا لێی

ڕازی نەبێت ، كۆتاییەكەی ڕازیت ناكات ..







(٢٩٣)

باوەڕم بەوەیە کە خودا لەگەڵ منە ،

ئەوە بهێنەوە بیری خۆت ، لەناخۆشترین و سەخترین کاتەکاندا ..



(٢٩٤)

ئیلاهی ڕێگام بدە بە جۆرێك خۆشم بوێت کە لەبەردەم

سەرپێچی کردنتدا بوەستم و ئەنجامی نەدەم .

چونکە خۆشەویستیەکەت ڕێگریم لێدەکا...



(٢٩٥)

خۆت بەجۆرێك ڕابێنە کارەکانت خۆش بوێت

ئارامبگرە لەسەر تاڵییەکانی ..





(٢٩٦)

خێرترین باشترین ڕۆژی مرۆڤ ڕۆژی تەوبەکردنیەتی بو لای خودای گەورە وەقبول بونی تەوبەکەیەتی .

«ابن القيم» رحمة الله

زاد المعاد ٣/٥١٢



(٢٩٧)

بۆهیچ کەس و هیچ شتێك و هیچ چێژێکی دوونیا
پەیوەندی نێوان خۆت و خودا تێك مەدە ..







(٢٩٨)

تەنها حَسْبِیَ اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ

ئەوە چارەسەریکە بۆ هەموو

{ دڵتەنگێك ، نەخۆشێك ، بێ هیواییێك ، زوڵم لێكراوێك ،

بەش خوراوێك ، خاوەن ئاواتێک }

بۆیە بەردەوام بڵێ :

حَسْبِیَ اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ



(٢٩٩)

وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَىٰ دَارِ السَّلَامِ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ،

««سورة يونس آية ٢٥»»

خودا بانگتان دەكات بو جێگای ئارامی و پر لە ئاشتی کە بەهەشتە ،

وە هەرکەسێک بەشیاو بزانێت رێنوێنی دەكات بو رێگای راست ..





(٣٠٠)

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

دڵێک سوپاسگوزار بێت ، زمانێک یادی خودا بکات ئافرەتێک چاک بێت هاوکارت بێت لە کاروباری دونیا و دینت ، باشترین شتە خەڵکی کویان کردبێتەوە ..

« صحيح الجامع ٤٤٠٩»



(٣٠١)

هەر کات هەستت کرد خەمێک دڵتی داگرتوە

پەنا ببە بۆ کەلامی خودا ..

چونکە تاکە پەناگەیە کە بەبێ قسە کردنت

ئارامت دەکاتەوە و سوکنایی دەبەخشێت بە دڵت ...



(٣٠٢)

دەنگی قورئانی پیرۆز

گوێگرتن لێی کانولایەکی دونیایی و دینی و قیامەتییە ..

بۆ مێشك و دەمار و خوێن و گۆشت ..





(٣٠٣)

خودات بەسە.

وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ.

واتە : وە هیچ شتێك نیە ئیلا خەزێنەكانی لەلای ئێمەیە، وە دایشی نابەزێنین لە ئاسمانەوە بۆ زەوی وە بۆ بەندەكان نایهێنین مەگەر بە ئەندازەیەكی دیاریكراو بە گوێرەی پێویستیان ...

هەموو شتەكانت ...

بەختەوەریت ،

ئاواتەكانت ،

سەلامەتیت ،

هاوسەرگیری كردنت ،

كارەكەت ،

ڕۆزیەكەت ،

هەمووی لەلای خودایە ، داوای لێبكە با وەك باران بڕژێن بەسەرتدا .

بەڵام بزانە كاتی دیاری كراوی خۆی هەیە ،تەنها بەپەلە مەبە ، دڵت ئاسوودەكە بەخودا ، دڵنیابە خودات بەسە ...





(٣٠٤)

کاتێك خودا فەرمان دەکات لە نێوان بەردێکی ڕەقدا
گوڵێك دەڕوێت کارەکانی تۆش هەمان شێوەن ...



(٣٠٥)

«فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا» سورة النساء(٩١)
هیچ کات دڵتەنگ مەبە دڵنیا بە خێر لەوەدایە کە دەبێت..



(٣٠٦)

ئافرەتی ساڵیحە
کاتێك لە ماڵێك نیشتەجێ بوو ئارامی دەکات ..





(٣٠٧)

صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ)

لە پڕ بەرەکەترین کاروکردەوەکان و باشترین ، و پڕ سوودترینیانە بۆ دین و دونیای موسوڵمان، بەتایبەت لە شەو ڕۆژی هەینی دا ...



(٣٠٨)

هەمیشە باوەڕت بە شتێك هەبێت کە پێی دەوترێت «قەرەبووی شیرین»
وە هەرکاتێك بە ڕۆژانێکی خراپ و ناڕەحەتدا تێپەڕیت
ئەوە لەبیری خۆت بهێڵەرەوە.
دڵنیابە دوای ئەم ناڕەحەتیانە خۆشی دێت و تاڵیی
هەموو شتێك لەبیر دەکەین ..







(٣٠٩)

قَالَ رَسُوْلُ اللّٰهِ ﷺ
الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ
مرۆڤ لە قیامە ت دا لەگەڵ ئەو کەسە کۆدەکرێتەوەو حەشر دەکرێت
کەلە دونیادا خۆشی ویستووە ...

«متفق علیه»



(٣١٠)

هەرکەسێک ئەم ئایەتە حەوت جار بلێت
﴿ربي أنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (٨٣) الانبیاء،
خودای گەورە ئەو زەرووزیانەی لەسەر لادەبات کە تووشی بووە ..

الفوائد لابن القیم ٢٩٢ / «ابن القیم» رحمة الله





(٣١١)

پێغەمبەری ﷺ دەفەرموێت

ئایا دوعایەکتان پێ بڵێم، هەرکاتێک

یەکێکتان توشی پەژارەیەک یان بەڵایەکی

دونیای هات ئەو دوعایە بخوێنێت ئیلا ڕزگاری دەبێت...؟

گوتیان بیڵێ .ئەی پێغەمبەری خوا ،

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دوعای یونس پێغەمبەر ..

(لَا إِلَهَ إِلا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ).



(٣١٢)

وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا

پشت هەر بەخوا ببەستە وە خوا بەسە پارێزەر بێت ...





(٣١٣)

قَالَ رَسُوْلُ اللّٰهِ (ﷺ) : لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ

ناچێتە بەهەشت ئەوکەسەی قسە دەبا و دەهێنێت بەبێ عەزاب و سزا ،

واتا : دوای عەزاب و سزا ئینجا دەچێتە بەهەشت ..

«متفق عليه»



(٣١٤)

تامەزرۆی هەموو تاقیکردنەوەکانم

لەگەڵ هەموو بەڵایەك زیاتر خودا دەناسم..





(٣١٥)

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ :

هەر کەسێك ئارام بگرێت ئەوا خوا ئارامیی پێ دەبەخشێت

وە بەهیچ کەس هیچ بەخششێك نەدراوە کەلە خۆگری

(الصبر)

گەورەترو خێردارتر بێت

( رواه مسلم)



(٣١٦)

اللهم استجابة لكل مافى قلوبنا

خودایە وەڵامی هەموو ئەو

دوعایانەمان بدەیتەوە کەلە دڵماندایە.





(٣١٧)

ئیمامی ئەحمەد « رَحِمَهُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ » دەفەرمووێت :

دونیاماڵی کارکردنە کۆتایش ماڵی پاداشت وەرگرتنە، هەرکەسێ لێرە کار نەکات لەوێ پەشیمان دەبێت ..

«المصدر: الزهد الكبير للبيهقي _ ٧٢٥»



(٣١٨)

(وَربُّكَ الأَقرَبُ والأَحَنّ )

خودا نزیکترین و میهرەبانترینە ..



(٣١٩)

ئومێدەکانی دڵتان بە دەوروبەرتانا بڵاوبکەنەوە

لەوەیە کەسێکی نائومێد بە ئومێدی بکەی ...





(٣٢٠)

چۆن
بێ ئومێد ئەبم لێت کە نزیکترین کەس لەمن تۆی ..
«وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ»..



(٣٢١)

ابن قیم دەفەرمووێت :
ئەگەربەقەد هەناسەکانت صەڵاوات
لەسەرپێغەمبەری خوا ﷺ بدەیت ، ناتوانی حەقی بدەیت ..
"اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَىٰ مُحَمَّد وَعَلَىٰ آلِ مُحَمَّد"





(٣٢٢)

ئیمامی سفیانی الثوري « رَحِمَهُ اللّٰهُ تَعَالىٰ » دەفەرمووێت :

هاوڕێیەتی ئەو کەسە مەکە کە منەتی چاکەکانی دەکات بەسەرتا . .

«شعب الایمان ، ٩٠٥٩»



(٣٢٣)

خۆشەویستی خودا فێرت دەکا چۆن

پێبکەنیت لە کاتێکدا کە دەگریت . .



(٣٢٤)

ئەگەر سەفەری ئەم دونیایە ئاسان بووایە «صبر» .

یەکێک نەدەبوو لەدەرگاکانی بەهەشت . .





(٣٢٥)

(أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)

دڵەکان تەنها بە یادی پەروەردگار ئارام دەبن..



(٣٢٦)

تۆ ئەو کەسە بە

«هەر کەسێك تۆی بینی بڵێ هێشتا دوونیا باشە».



(٣٢٧)

ژیان ماندوومان دەکات و یادی خودا ئاسودەمان دەکات..





(٣٢٨)

ڕەنگە بە چەندین کاتی سەخت و دژواردا تێپەڕ ببین
ڕەنگە دڵتەنگ ببین ڕەنگە ئازار بچێژین بەڵام لەگەڵ
هەموو ئەوانەشدا هیوایەکی گەورە بۆ ژیان دەمێنێ
ئەویش بگەڕێوە بۆ لای خودا ...!



(٣٢٩)

«وَمَن أَعرَضَ عَن ذِكرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحشُرُهُۥ يَومَ ٱلقِيَٰمَةِ أَعمَىٰ»
هەر کەسێک لەو قورئانەم ڕوو وەرگێڕێ ئەوە بێگومان
ژیانێکی سەختی دەبێ، هەرچەند خاوەنی دونیایش بێ..







(٣٣٠)

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

ئاسانکاری بکەن سەختگیر مەبن ،

مژدە دەربن و خەڵکی ڕاوەمەنێن لە دینداری .



(٣٣١)

شەرت نییە هەموو جارێ بەڵا بۆ سزا و ئەشکەنجەی

ئینسان بێ ، بەڵکو هەندی جار بۆ پاک و پاڵفتەکردنیەتی ..

ابن القیم







(٣٣٢)

وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا
جا ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت ،
ئەوە خوا دەرووی لێ دەکاتەوە...

سورەتی الطلاق ٢



(٣٣٣)

ئەوەی پێداویستیەکانی مرۆڤ لە هەموو شت زیاتر دابین دەکات ،
دۆزینەوەی دڵێکە کە خەمخۆر و هاورازبێت ..



(٣٣٤)

هەندێك خەڵك وەکو گوناهـ وان ئەگەر وازت
لێهێنان خودا بە ڕوتدا دەکرێتەوە ..





(٣٣٥)

"وَلَا يَحرِمُكَ أمراً إلَّا لِخَيرٍ"
لە شتێك بێبەشت ناكات ئیلا خێری تێدایە
كەواتە بە ئاسوودەی ژیان بكەن..



(٣٣٦)

بۆ ئەوەی كەسێكی بێ ڕەحم بیت ،
پێویست ناكات كەسێكی بەهێزبیت ..

د. عەلی شەریعەتی



(٣٣٧)

كاتێك خودای گەورە دەیەوێت پەردە لەسەر نهێنیەك
لابەرێت هەموو دروست كراوەكانی ناتوانن ڕێگەی لێبگرن ..





(٣٣٨)

دواکەوتن مانای شکست نیە لەوانەیە مانای خۆئامادەکردن بێت بۆ دەستپێکێکی مەزن..!



(٣٣٩)

ابن تیمیە خوا لێی ڕازی بێ دەفەرموێ :

«إنَّ في الدُّنيا جنَّة من لم يدخُلها لا يدخل جنَّة الآخرة»

بەراستی بەهەشتێك لەم دونیایەدا بوونی هەیە هەر کەسێك نەچێتە ناویەوە ناچێتە ناو بەهەشتی دونیای ئاخیرەتەوە...



(٣٤٠)

کاتێك ئامانجێکت هەیە ،

تەنانەت بیابانەکانیش دەبنە ڕێگا ..





(٣٤١)

﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ﴾
پێی بسپێرە هەر شتێک کە ئاواتی پێ دەخوازیت



(٣٤٢)

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت :
نزیکترین کات کەبەندەکان لە خوداوە نزیك بن ئەو کاتەیە
کە لە سوجدەدا بن , کەواتە دوعای زۆر بکەن ..

صحيح مسلم ( ١١١١)



(٣٤٣)

ئامین
بۆ هەموو ئەو دوعایانەی
کە تەنها خودا دەیزانێت ،
بۆ هەموو ئەو ئاواتانەی کە گریاوین بۆیان ،
ئامین بۆ هەموو ئەو شتانەی لە دڵماندان ...





(٣٤٤)

لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ

ئەگەر لەبەرامبەر نیعمەتەکانمەوە سوپاسگوزاریی بکەن ،

ئەوا منیش نیعمەت و بەخششی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم ...

سورەتی ابراهیم(٧)



(٣٤٥)

قال رسول الله ( ﷺ )

من دلَّ على خيرٍ فله مثلُ أجرِ فاعلِه

پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت :

هەر کەسێك ڕێنمووی خەڵکی بکات بۆ کارێکی باش ،

پاداشتی ئەو کەسەی بۆ دەنوسرێت کە ئەنجامی ئەدات ..

أخرجه مسلم : : ١٨٩٣





(٣٤٦)

چەندە جوانە کە بەهێزترین چەکی ئێمە ئارامگری بێت

کێ هەیە لە ئێمە کێشەی نەبێت

کێ هەیە دووچاری ناڕەحەتی نەهاتبێت !

کامە لە ئێمە بێ خەمین

دەی ئێوە پشوو درێژبن لەسەر ناخۆشیەکانتان ،

هۆی بەدەستهێنانی چونکە دەبێتە

خۆشەویستی پەروەرێنی جیهان

{وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ}

«خودا ئارامگرانی خۆشدەوێت»...



(٣٤٧)

ئەبێت گوڵفرۆش بۆنی گوڵ و

ئیمانداریش بۆنی ئیمانی لێبێت..

سەعدی شیرازی





(٣٤٨)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : شەیتان وتی سوێند بە گەورەییت پەروەردگارم بەردەوام بەندەکانت گومڕا دەکەم تا ئەو کاتەی ڕۆحیان لە لاشەیاندا بێت ، پەروەدگار فەرمووی : سوێند بە گەورەیی و مەزنیم بەردەوام لێیان خۆش ئەبم تا داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن ..

السلسلة الصحيحة ( ١/٢١٢ ) ..



(٣٤٩)

هیچ کات بێ هیوا مەبە چونکە
خودایەکت هەیە دەفەرموێت :
«وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ»
ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتۆتەوە ....





(٣٥٠)

دڵنیابە

و ئیمانت هەبێت،

خودا ،

چارەی هەموو کێشە و خەم و دڵتەنگییەکانتە...



(٣٥١)

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) دەفەرموێت :

ڕێنیشاندەری ڕاستەقینەیە بۆ خۆشەویستی خودا و ڕێگاکەی ئەو و شوێنپێ هەڵگرتنی گەیشتنە بە خۆشەویستی خودا ...

(قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ) .





(٣٥٢)

لەگەڵ خودای خۆمدا هەمیشە دەتوانم لە سفرەوە دەست پێ بکەمەوە
هەمیشە دەتوانم پێی بڵێم خودایە ئەوە هاتمەوە
خودای من هەمیشە پێم دەڵێت بێ هیوا مەبە ئەگەر
زەوی و ئاسمانت پڕ کردبێت لە تاوان ئەوا پڕ بە
هەردووکیان لێبوردنت پێ دەبەخشم بەس بگەڕێرەوە ..
ئەو هەموو شەوێك دێت و پێم دەڵێت
داوای لێخۆشبون بکە تا لێت خۆشبم ..
ئەو پێم دەڵێت گەر تۆ بە ڕۆشتن بۆلای من بێیت
ئەوە من بە ڕاکردن بۆ لای تۆدێم
تۆ سەیری ئەم سەودایە !
لە بەرامبەر بچوکی مندا گەورەیی ئەو
لە بەرامبەر تاوانی من لێبوردەیی ئەو
لە بەرامبەر بەپێ چونی من بە ڕاکردن هاتنی ئەو
تۆ سەیری ئەم سەودایە !
من تاوان دەکەم کەچی ئەو دێت تا لێم خۆشبێت
تۆ سەیرکە چەند مەزنە پەروەردگار ...





(٣٥٣)

لە زانایەکیان پرسی ؛

قوربان حاڵی ئەصحابی حەزرەت ﷺ :

چۆن بوو لەگەڵ قورئان؟

ئەویش فەرمووی : وەکو حاڵی ئەمڕۆی خەڵک بوو

لەگەڵ بەکارهێنابی موبایل ..

واتا چۆن ئێمە ڕۆژانە موبایلەکانمان بەکار ئەهێنین بە بەردەوامی

ئەوانیش زیارەتی لاپەڕەکانی قورئانیان ئەکرد بە بەردەوام...



(٣٥٤)

جوانترین شت لە فریاکەوتنی خودایی ئەوەیە :

لە کاتێکدا دێت، کە بێئومێد بوویت لە هەموو هۆکارەکان ،

لە کاتێکدا دێت، تەنها خودا لە دڵتدا ماوەتەوە...





(٣٥٥)

مرۆڤ بونەوەرێکی زۆر بێدەسەڵاتە
بەرامبەر بچوکترین نەخۆشی و ناخۆشی
ببینە دان ئێشەیەک تەواوی خەوەکەت لێ تێک ئەیا
سەرئێشەیەک وات لێ ئەکات هەست بکەیت دونیا بەسەری تۆوەیە
پەتایەکی وەرزی و کاتی تاقەتی قسەشت ناهێڵێ
هەرچەندە ئەمانە شتانێکی یەکجار سادەن
کەوایە هەرگیز خۆت پێ گەورە نەبێت کەبەرگەی هیچ شتێک ناگرین
وە خوداش خۆبەگەورەزانانی خۆش ناوێت
وێنەیەکی نزیک لە چاوی مرۆڤ دوای گریان...



(٣٥٦)

«خـوای گەورە هەرگیز نەی فەرمووە
ڕێگـاکە ئاسانە ...»
بەڵکو دەفەرموێت
«دڵنیـابن کەخودا یارو یاوەری خۆگر و ئارام گرانـە
الصبر».





(٣٥٧)

(وَلَا يَنْزِلْ عَلَيْكَ بَلَاءٌ إِلَّا لِخَيْرْ)

وە هیچ بەڵایەک دانابەزێنێ ئیلا خێرێکی تیایە...



(٣٥٨)

کەسانێك هەن کاتێك تۆ باسی ئازارو نارەحەتیان بۆ دەکەی

ئەوان باسی هیوا و خۆراگریت بۆ دەکەن .

ئەو مرۆڤانە نیعمەتی خودان.

هەوڵبدە هەرگیز لەدەستیان نەدەیت ..!







(٣٥٩)

دواکەوتن مانای شکست نیە لەوانەیە مانای خۆئامادەکردن بێت بۆ دەستپێکێکی مەزن ..!



(٣٦٠)

ئەو ئازارەی کە مرۆڤ دەرسی لێ وەرناگرێ ،
شایەنی ئەوەیە جارێکیتر بیچێژێتەوە ..!



(٣٦١)

وَاللهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ
خودا تۆڵە سێنەرێکی بەهێزە ....





(٣٦٢)

{ خوا گوێی لەوانەیە کە سوپاسگوزارن } .

ئەی نزاکانت ..

ئەی گریانەکانت ..

ئەی ئەو هەموو شتانەی کە تەنها بۆ خودات باس کردوە ..

ئەی ئەو کاتانەی نەتوانیوە هیچ وشەیەك بەدەم بڵێی وە وتوتە خودایە تۆ خۆت لەمن باشتر هەموو شت دەزانی ..

ئەی ئەو خەونانەی کە پێت وتون ئێمە خوایەکی بەدەسەڵاتمان هەیە .

ئەی ئەو غەمانەی کە وتوتە پێیان ئێمە خودا لەگەڵمانە ..

هیچ کام لەمانە لەبیر ناکا دڵنیابە ..!







(٣٦٢)

هەر چەند بەدین تر بیت ..

ستایلی ژیانت بۆ باشتر دەگۆڕێ..

بەڵێ هاوڕێ لەدەست ئەدەی..

بەڵێ لەوانەیە بەدووڕوو بانگت کەن..

چونکە تۆ ئیتر بەژداری گوناهەکانیان ناکەی..

بەڵام

تۆ قیامەت هەڵەبژێری لەکاتێکدا ئەوان

بەدوای دوونیاوەن ..

بەس وەاللە

تۆ زۆر بەبەختی

چونکە زۆر چاکترە خەڵک لەدەست بەی

نەک اللە ...

الحمدالله..





(٣٦٣)

خـودا بەجۆرێک سەبرت تاقی ئەکاتەوە لەقورسترین کاتەکانی ژیانت شتی تر دێنێتە ڕێت بڕواکەن بەجۆرێک گریانت دێت خۆشت نازانی چۆن فرمێسکی چاوت ڕاگری ...

دێت و دەڵێی لەناخت خوا سێرم ئەکا زوو زوو دەڵێی خودام لەگەڵە دەست ئەخەیتە سەر دڵت و ئارام ئەگری زوو زوو دەڵێی سوپاس بۆ خوا.. بگرە موزگێنی خوا ڕازی ئەکەی لەخۆت ئاگاداری شەق شەقەی لەرزینی ، قاچەکانت و فرمێسکی چاوەکانت و دڵت و زمانت یادی خودا ئەکەن و دەڵێن «صـــبر» دەگرین ...

خـۆزگەم پێـت خودا بۆت قەرەبوو ئەکاتەوە ودڵخـۆشت ئەکا ئەم جارە لەبری گریانی سەختی گریانی خۆشی دێتە خوار .. فەرموی بێتاقەتین و چاومان پڕە بەڵام شتێک ناڵێین خودا پێی ناخۆش بێت خـۆشەویستی خودا فەرموویەتی دەسا ئێمەی بەندەیەکی کەم چاکە با ئارامگری بکەینە چاکەیەکی کەم بۆ هەردوو دوونیامان ...

اللـهم صل علی محمد وعلی ال محمد





(٣٦٤)

کەخودا حەڵاڵ و حەرامی جیاکردۆتەوە ..
بێ هودە نیە هەڵبەتە حیکمەتێکی تێدایە..
چ شتێک لەوە جوانترە بەحەڵاڵی شتەکان هەڵبژێری..
بیرکەوە بۆ ئەبێ شتە حەڵاڵەکان هەڵبژێرین دەی بڕواکە بەسەر بەرزانە شانازی پێوە دەکەی وەک لەشتە حەرامەکە کە بدزی و فزی ئەیکەی ..»
بۆیە با هەمیشە هەڵبژاردنەکانمان حەڵاڵ بێت»..
شتە باش و جوان و پاکەکان و خۆشەویستەکانی
خودا لە حەڵاڵدایە نەک ئەوەی تۆ کە بە حەرامی ئەنجامی ئەدەی درەنگ نیە ئێستا ئەتوانی ئەنجامی بەی حەرام بکە بەحەڵاڵ یەک تەوبەی پێیوستە ....»
ژیانت بڕازێنەوە لەگەڵ حەڵاڵەکان
ببە بە بەندەیەکی باشی پەروەردگارت ..
الحمد لله علی کل الحال





(٣٦٥)

لەیادیان کـە..

ئەو ئازارانەی هاتە ڕێت

ئەو کەسانەی پشتیان تێکردی

ئەو کەسانەی ئازاریان دای

ئەو سەختییەی هاتەڕێت

نەبەخەم و نەگریان نەچاك دەبنەوە نەوەك خۆیان لێدێتەوە..

بۆیە خەندەیەک بکە بەڕووی هەمویان

خودات بەسە بۆڕێگا دڵخوازەکەت

خودات بەسە بۆ هەموو کاتەکانی ژیانت ئەو بەدەست بێنەوە

تا ژیان بکەی هەم لەم دووینا هەم لەو دوونیا.







(٣٦٦)

کاتێك کە دڵت تەنگ دەبێت ...

خۆت تەنها مەکە..

گۆرانی مەڵێ و گوێشی لێ مەگرە ..

مەگـری

هاوار مەکە

توڕە مەبە

ناشکوری مەکە

بـەڵکو....

دەست نوێژ بگرە

نـوێژ بـکـە

قـورئان بخـوێنە

دوعا بکە و بپاڕێوە لە خـودا بیر لەدەسەڵاتی خودا بکەوە ئارام بگرە و صەبرت هەبێت ئەمانە جێبەجێ بکە دڵنیابە ان شاء الله دڵ خۆش دەبیت و دڵ تەنگیـشت نامێنێت ...

اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلىٰ مُحَمَّد وَعَلىٰ آل مُحَمَّد





(٣٦٧)

زۆرجاری وابووە کە سەرمان خستۆتە سەر سەرینەکە ..
دڵمان پڕاوپڕ بووە لە خەم و حەسرەت ..
لێ بەیانی شتەکان زۆر دەگۆڕێن .
خودا ئارامییەک دەخاتە دڵتەوە خەمەکەت لەسەر
ئاسان دەکات ، یا لەوەیە ئەوەی خەمی
پێوە دەخۆی ئیدی لەمە بەدوا ببێتە
هۆی دڵخۆشبوونت ..
کارەکانی خودا وان ، لەوپەڕی بێئومێدی و بێزاریەوە
بەرەو شادی و بەختەوەری دەتهێنێ
بە ئومێدی ئەوەی خەمەکانت لە سپێدەی زوودا
لەگەڵ نەسیمی سوبحدەمدا بگۆڕێن بە کامەرانی ..
خودا کامەرانت بکات.







(٣٦٨)

یادگاریەکان دەبنە تیرێك بۆدڵمان دەسا ئاگاداربین چ شتێك دەکەینە یادگاری ژیانێکی پڕ تاقیکردنەوە بوونی هاوڕێکەت لات بۆچەندین ساڵ لەناکاو ون دەبێت جا هەر چۆنێک ون بێت گرنگ ئەوەیە بووە یادگاری .. بوونی خۆشەویستە حەرامەکەت لات کە ئایندەی پەیوەندیەکە دیارە یادگاریەکت بۆ بەجێدێڵێت سارێژی نیە ئەو تیرەی کەهاویشتی بۆ دڵت خوێنی لێدێنێت .. بوویت و بوونی ئەو شتانەی پێوەی هۆگر بوونە یادگاری ئێستا بۆت من ئەمەوێت ئەوە بڵێم :

لەژیانی هەمووماندا یادگاریەکی کەسانێك و شتانێک

هەن کەدێنەوە خەیاڵمان فرمێسك بێ هۆ دێتە خوار بەچاوماندا شتێك

مەکە ئێستا کەدەزانی کۆتایەکەی دەبێتە یادگاریەکی زۆر تاڵ بۆت ..

خودا لەپێش هەموو شتێک دابنێ شتێک مەکە

خودا پێی ناخۆش بێت ئەگەر کردووشتە ئێستاش درەنگ نیە

وازی لێبێنە «خودا گرینگ ترە لەهەموو شتێک» .

بگری ئازار بچێشە بەس لەخودا نەکەی نائومێد بیت

زۆر بەجوان تر بۆت قەرەبوو دەکاتەوە ئەو یاردگاریە تاڵەی

ئێستا ژیانی لێتاڵ کردوویت ..





(٣٦٩)

زۆرت تێپەڕاندووە و کەمت ماوە

بۆیە هەرگیز نەهێڵیت بۆ هیوایی توشتبێت چونکە

لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكٰفِرُونَ ) )

هیچ کەسێك نائومێد نابێت لە ڕەحم وڕەحمەتی پەروەردگار

ئیلا ئەو کەسە کافرو بێبڕواکان نەبێت ئەوە بزانە پەروەردگار

تەنها سەیری ئارامیت دەکات ..

(فَصَبۡرٌ جَمِيلٌ)

ئەیوب ئاسا صەبر بگرە چونکە

إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ) )

الله تعالی لەگەڵ ئارامگراندایە جا

سوێند بەالله تاقی دەکرێینەوە بەڵام لە کۆتاییدا

(وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ)

بۆیە هەر مژدە دەدرێ بەوانەی صابر و خۆڕاگر بوونە

ئێستا تەماشایی خۆت بکە و بزانە تا چەند پشتت

بە الله عزوجل بەستووە تا چەند توکلت بە اللمیە ...

{ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥ} ..)





(٣٧٠)

خـودا دەیهێنێت ..

نەک وەک ئەوەی خۆت ئەتەوێت

یان جـوانتر یان دڵخۆشتر دەهێنێت

ئەوەی تۆ ئەتەوێت ئەگەر بەدەستی بێنیت

لەداهاتوودا خەمبارت ئەکات ..

بۆیە خودا بەشێوەی خۆی پێت ئەدات

لەکاتێکدا تۆ پێت وایە خودا لەبیری کردوی ..

پێشت ئەدا وەک ئەوەی خۆت دەتەوێت

چونکە ئەو بەڕەحم و میهرەبانە ..

هەر شێوازێکت پیبدا تۆ دڵخۆش بە

چونکە خودا خۆی دەزانێت باشترین چیە بۆ بەندەکەی ...







(٣٧١)

هيبة الصمت أجمل من ألف حديث

شکۆی بێدەنگی جوانترە لە هەزار قسە ...



(٣٧٢)

ڕۆژێك خودا دەرگایەکت بە ڕودا ئەکاتەوە قەرەبووی

تەواوی دەرگا داخراوەکانی ژیانت دەکاتەوە ..







(٣٧٣)

دڵخۆشکردنی هەموو کەس لە توانای تۆدا نییە

ئەوەندە بەسە هیچ کەس بەهۆی تۆوە ئازار نەچێژێت .. !



(٣٧٤)

ئەگەر دڵی خۆشبوایە

ڕووی ئەگەشایەوە وەك بڵێی پارچەیەکی

تەواوە لە مانگ .!

کەعبی کوڕی مالك لە وەسفی پێغەمبەر گیان ( ﷺ )







(٣٧٥)

ئیمامی «عەلی» دەڵێت
نەرم بن بەڵام لاواز مەبن !
بەهێز بن بەڵام توندوتیژ مەبن ...



(٣٧٦)

لە دڵەوە هانا بردنێك بۆ خودا دەتوانێت
ئەوە بگۆڕێت کە بەلاتەوە زۆر ئەستەمە ...



(٣٧٧)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی :
دەم و چاوی ئەو کەسە گەشاوە و درەوشاوەبێت
کە فەرمودەیەك دەبیستێ و دەیگەیەنێتە کەسانێك کە نەیانبیستوە .!

| متفق علیه |





(٣٧٨)

(فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ) سورة الأنبياء - اية ٨٤

ئێمەش وەڵاممان دایەوە و ئەو نەخۆشیەی

کە هەیبوو لامان دا لەسەری شیفامان دا....



(٣٧٩)

فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ

واتا : وە خوای گەورە بیەوێ هەر بڕیارێك بدات و هەر شتێك

دروست بکات لەبەر تەواوی دەسەڵاتی تەنها دەفەرمووێ :

بە یەکسەر ئەو شتە دروست دەبێ .





(٣٨٠)

گلەیی ..

مرۆڤ پێویستە بگاتە قۆناغێک کە هەرگیز گلەیی لەکەس نەکات

لەبەر ئەوەی :

قیسمەتەکانی ئێمە دیاریکراوە و کەس توانای گۆڕینی نییە»

پاشان ئەوەی بە مەبەست هەڵەمان لەگەڵ دەکات ئیتر جێی گلەی نیە و عەیبەیە مرۆڤ سەرزەنشتی دوژمنەکەی بکات بەڵکو دەبێت گلەی لەخۆی بکات چۆن شتی وا دەکات بە هاودەم و هاوڕێ کەتوانای هەبێت تەنانەت یەک غەیبەتیشی بکات ..

ئەو کەسانەش کە بەبێ مەبەست و بەنەزانی هەڵەدەکەن ، دیسان جێگەی گلەی نین و ناکرێت سەر زەنشتی کەسێکی بێ تاوان بکەی ..

گلەییەکانت ،

ئازارەکانت ،

ڕاز و دەردە دڵەکانت تەنیا بۆ خوا باس بکە ،

زۆر گرنگە مرۆڤ بگات بە قۆناغی :

{ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ }





(٣٨١)

هەموو شتێك بسپێرە بە خوا
هەرچی دڵتەنگی و غەمە دلی داگیر کردووی
دڵنیابە بچوکترین شتیش
بەبێ ئەمری خودا ڕوونادات و نابێت
بۆیە دڵتەنگی وەلا نێ و هەولبدە بە ڕازی بوونی
تەواوەتی خۆت ڕابهێنی لەسەر ئارامگری
تا ئەوکاتەی خوا لەسەرتی ئاسان ئەکات و
خۆشی و ئارامی دێتە ڕێگات و ناو ژیانت....



(٣٨٢)

ئامۆژگاری یاسەمین بۆ سوگەندی کچی :
دونیای ئینتەرنێتی زۆر بێ بەزەییە کچم مرۆڤەکان هەزار
جۆر شێوەیان هەیە کە هیچیان شێوەی
ڕاستەقینەی خۆیان نیە ..!
سوودی لێ وەربگرە ، بەڵام ئاگاداربە
مەهێڵە یاری بە هەستەکانت بکەن ...





(٣٨٣)

«لاحول ولاقوة الا بالله»
دەبێتە هۆی لابردنی «٩٩» ناخۆشی
کە بچووکترینیان خەمە، لەمە جوانترم نەدۆزیەوە چونکە مرۆڤەکانی ئێستا
زۆربەی زۆریان لە خەمدا غەرقبوونە وە تەنها خودا دەتوانێت ڕزگارمان بکات



(٣٨٤)

وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ
لەهەر کوێ بن خوا لە گەڵتانە ...



(٣٨٥)

ڕەنگە ژیانی تۆ بە دابڕان
لەوانی تر جوانتربێت ، هەر بۆیە غەمبار مەبە ..





(٣٨٦)

رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النَّار

پەروەردگارمان لە دونیادا چاکە و لە قیامەتیش کە چاکە و لە عەزابی ئاگر بمانپارێزە ...



(٣٨٧)

وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ

وە بێگومان هەر ئەویش بەندەکان دەخاتە گریان و پێکەنین .



(٣٨٨)

من شتێکم ویست و خوداش شتێکی تری ویست بۆم

سوپاس بۆ خودا بۆ ئەو خێر و چاکەیەی کە من نایزانم لە چیدایە ...





(٣٨٩)

{ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ }. الكهف: ٨١

ویستمان بەوکارەیە پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ

هەموو شتێک کە لەدەستی دەدەین زەرەر نییە ،

ڕەنگە خودا بیەوێت نیعمەتەکە بگۆڕێت بە نیعمەتێکی باشتر، دڵنیابە ..



(٣٩٠)

هیچ شتێک هێندەی بیرەوەرێکانت ناتکوژێت ، بۆیە بزانە

کێ هەڵەبژێریت بۆ ژیانت ...







ئەوەی نوێژ نەکات خوای گەورە ١٥ سزای بۆ داناوە ..

١.هیچ دووعایەکی کەسە باشەکانی بۆ ناچێ .

٢. خێر لە تەمەنی ئەسێنێتەوە

٣. هیچ ئاواتێکی نایەتە دی

٤. هیچ دووعایەکی ناگات بە ئاسمان

٥. هیچ کارێکی ناگات بە ئاسمان

٦. خوودا چاکەکارانی لەبەرچاو لادەدات

٧. بە زەلیلی ئەمرێت

٨. بەبرسێتی ئەمرێت

٩. بەتوونیەتی ئەمرێت

١٠.خوای گەورە ئازاری زۆری ئەدات

١١. قەبرەکەی دەبێت بە دۆڵێك لە دۆڵەکانی دۆزەخ

١٢. قەبرەکەی تەسك دەبێتەوە ئێسکەکانی دەشکێنێت

١٣. خوای گەورە بە توورەییەوە لێپرسینەوەی لێدەکات

١٤. خوای گەورە فەرمان ئەکات ژەسەر دەم ڕایکێشنە نێو دۆزەخەوە .

١٥. لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە و دەسوتێ تا لەتاوانەکانی پاك دەبێتەوە .





پاداشتی گەورەیی ئەم زیکرە ...

فریشتەکان بەرز بوونەوە بۆ ئاسمان و وتیان : پەروەردگار
بەندەکەت نزایەکی کرد نەمانزانی چۆن
پاداشتەکەی بنوسین.!
پەروەردگاریش فەرمووی : بەندەکەم وتی چی؟
فریشتەکانیش وتیان :
{ ياربي لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك و عظيم سلطانك } .
پەروەردگار دەفەرموێ بەو چەشنەی خۆی تۆماری بکەن
تا بەدیداری بەندەکەم دەگەم
ئینجا پاداشتی دەدەمەوە لەسەری.

ابن ماجه (٣٨٠١)









حەقیقەت و پێکهاتەی تەوبە چیە ؟

حەقیقەت وپێکهاتەی تەوبە سیانە :

تێگەیشتن ، هەستی پەشیمانی ، کردەوە .

تێگەیشتن لەوەی کە گوناهـ زەرەری هەیە ودەبێتە پەردە ودیوار

لە نێوان بەندە وخۆشەویستەکەیدا ، ودوورکەوتنەوە لێی هەستکردن

بە نارەحەتی وترسی لە دەستدانی خۆشەویست وپەشیمانی لە ناخەوە

قەرەبووکردنەوەی ئەوەی لەدەستت داوە

بە ئەنجامدانی کردەوەی چاک وسڕینەوەی تاوانەکان .

اللهم اجعلنا من التوابين واجعلنا من المتطهرين..

٢٨٣ مەبەست کاژاوی







نموونەی هاوڕێی چاك و هاوڕێی خراپ ..

عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ
« مَثَلُ الجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ، كَحَامِلِ المِسْكِ وَنَافِخِ الكِيرِ، فَحَامِلُ المِسْكِ: إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً « .

أَبُو مُوسَى خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت:
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
نموونەی هاوڕێی چاك و خراپ وەك نموونەی هەڵگری بۆنی میسك - واتە بۆن فرۆش - و فووكار بە كورە دا - واتە ئاسنگەر - وایە ، هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێ دەبەخشێت ، وە یان لێی دەكڕی وە یان بۆنی خۆشی لێ دەكەیت ، وە فووكار بە كورە یان جلەكانت دەسوتێنێت، وە یان بۆنی پیسی لێ دەكەیت...

رَوَاهُ البُخَارِي : ١٠١





دونیایەکی هەمیشەی مەکەنە قوربان دونیایەکی کاتی

خۆشەویستی حەرام یان عیشقێك کە لە پێناوی حەقدا نەبێت

ئەوەندە ئازاری تێدایە کە لەزەتە کەم و جوزئێکەی تاڵ دەکەن .

یەکێك لەو ئازارانە ئازاری غیرەت و حەسوودییە .

یەکێکی تریان ئازاری خۆشەویستی نەگۆڕینەوەیە لەنێوانی یەکتردا وەك

و یەك ، جگە لەمانەش چەندین ئازاری تاڵ و لێڵکەری تر هەن کە ئەو

لەزەتە جوزئییە وەك و هەنگوینی ژەهراوی لێدەکەن

«بەدیعوزەمان سەعیدی نوورسی»







گەورەیی نوێژی بە کۆمەڵ

قَالَ رَسُوْلُ اللّٰه ﷺ

صَلاَةُ الجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً

نوێژی بەکۆمەڵ بیست و حەوت جار خێری زیاترە لە نوێژی بە تەنیا.

ئاگاداری نوێژەکانتان بن..

«متفق علیه»







گەورەیی داوای لێبوردن بۆ ئیمانداارانی ژن و پیاو ..

قال رسول الله (ﷺ)
مَن استغفَرَ للمؤمنينَ وللمؤمناتِ ،
كتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مؤمِنٍ ومؤمنةٍ حسنةً
پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت :
هەرکەسێك داوای لێخۆشبوون بۆ ئیمانداارانی ژن و پیاو بکات ،
خودا بە ژمارەی ئیماندرانی ژن و پیاو چاکەی بۆ دەنوسێت...
أللَّهُمَ أغفِر لِلمؤمِنين وَالمؤمِنات ...

صحيح الجامع : ٦٠٢٦





ئەگەر بارگرانی تاوانێکت لەسەر شانە و هەنگاوەکانی ژیانتی قورستر و سەختر کردوە ، لێ مەگەڕێ و زمانت قورس مەکە لەوەی داوای لێبوردن بکەیت ، شەرم مەکە لەگەڕانەوەت و قسەکردنت بۆ خوای گەورە ئەو تۆو گەڕانەوەکەتی خۆشدەوێت وەك هەموو جارەکانی تر لێت خۆشدەبێت و دەرگاکانت بۆ دەکاتەوە، ژیان قورس مەکەن بۆ تاوانێك و هەڵەیەك کە دڵنیایت خودا لێت خۆشدەبێت و تەنها هەنگاوی یەکەمی خۆتی ئەوێت ، خودا زاتێکی هەمیشەیی و خاوەن بەڵێنی { يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا } یە ، هەر کات ویستت قسەی بۆ بکە بەڵام ئەوەشت بیر نەچێتەوە ئێمە هەموان مردویەکین کە هێشتا کاتی ناشتنمان نەهاتوە پەلەبکە تا کاتت تەواونەبووە. ووە دڵنیابە لێت خۆشدەبێت چونکە خۆشیدەوێت .





